| | |
|---|---|
| سرشناسه | ناصری، انور، ۱۳۶۷ - |
| عنوان و نام پدیدآور | ریوی جامقولیباز / هەلبژاردن و وەرگیران ئەنوەر ناسری(ئاسو).؛ وینەکیش: سەمیرا رەشنەواز. |
| مشخصات نشر | سنندج: انتشارات علمی کالج، ۱۳۹۲ |
| مشخصات ظاهری | ۱۲۰ ص.: مصور. |
| شـابک | ۹۷۸-۶۰۰-۷۱۶۸-۰۸-۰ |
| وضعیت فهرست نویسی | فیپا |
| یادداشت | کردی. |
| یادداشت | عنوان به فارسی:روباه مکار |
| یادداشت | گروه سنی:ب.ج. |
| موضوع | داستان‌های کوتاه |
| موضوع | داستان‌های حیوانات |
| رده بندی دیویی | دا۱۳۹۲ر ۱۷۲ن۸۰۸/۸۳ |
| شماره کتابشناسی ملی | ۳۳۶۴۶۱۴ |


ناوی کتێب: ڕێوی جامقولیباز / هەڵبژاردن و وەرگێران: ئەنوەر ناسری (ئاسۆ)

وێنەکێش: سەمیرا ڕەشنەواز / گرافیک: دەریچە

پەخشانگای زانستیی کالێج / بەڕێوەبەر: کەیوومەرس کەرباسی

پیتچنین و ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان: سنە ڤیان کامپیوتر / ڕووبەرگ: ئەسرا مەردۆخی

نۆرە و ساڵی لەچاپدان: چاپی یەکەم-(بهار ۲۷۱٤) ۱۳۹۳ / ئـەژمـار: ۲۰۰۰ بەرگ

نـرخ: ٤٥٠٠ تمەن

مرکز پخش: سنندج، سه راه ادب، مجتمع تجاری کردستان، طبقه همکف، واحد ۱۶۱و ۱۶۲
تلفن: ۳۲۹۱۰۸۶ - ۳۲۳۷۲۳۷ ۰۸۷۱ فکس: ۳۲۳۵۷۹۶ ۰۸۷۱

انتشارات علمی کالج

ئەم بەرهەمـە پێشـکەش دەکـەم بـە دوو مامۆسـتای بەرێزم کە زۆر یارمـەتیمیان دا و هیـوادارم تـوانیبێتم ولامـی چاکـەیانم دابێتـەوە: مامۆسـتا «عـەدنان بەرزنجی» و کاک «مەزهەر ئیبراهیمی».

پێرست

## پێشەکی:

یەکێ بوو یەکێ نەو لە خوا گەورەتر کەس نەو، لە بەنە درۆزنتر نەو، لە قالاو ڕووڕەشتر نەو، کۆسە مرد کفـنی نـەو، کفـن لـە کاشـانوو، ڕێـی کاشان ڕێبـەنانوو، گاسـوور مەلـەوانوو، ئەمەیشـە گنـە ئەوەیشـیە گنـە، گەلالیە، شێخ ئیسماعیلیە، سـێفەوەنە، بلیلەوەنـە، قیتکەوەنـە، هـەرێز و لەولاو چووە نووچەوە، کەلەگا لە برسیەتیا چووە ڕیچەوە، هەرێز و لەولاو بە یەکا هەلچوو، بزن لە برسیەتیا گیانی دەرچوو، قوتە وە فیکـە مـەلاتی چـڕی، کەڕەوالـە دەرهـات جووچکـەیان بـڕی، وادی بـە وادی، تەختـە مورادی، خواجە و قەمـەر، عـەلی نـەزەر، دەشـتی گـردە بـەر، تـا ڕۆژی مەحشەر. عەلی نەزەر، خواجە و قەمەر، گوڵ و گولسـان، بـاخ و بۆسـان، تایلە و مایلە و گالە و دلخوازی لە بـێخ دار زریشـکە، گارەگـار مریشـکە، مەکەمەکەی کەنیشکە، حاتەحات کەورێشکە، هەر لە دۆم گەزگەز، تابان شاسەیوان داگیری کردگە عەزە قـولیخـان، وە ئـەرواح ناکـەم وە شـای

قەمەروەیس، مەحموو پاوشای کوشت کوڕ عـەزەی شـاوەیس، جـا بـووە قاوە قاو، بووە قیڕە قیڕ، سەراپەردەی حاکم گەییە سـەراو سـەرەنێر. لـە وڵات ئێمە پاوشـایک بـوو، پاوشـایش کەنیشـکێکی بـوو، تـا بـاڵای بـوو پەلکەی بوو، ئاوی ئەخوارد لەبەر ناوکیا گیری ئەخوارد، وە گیـان ئـابرای قەسەمی ئەخوارد، کوتەکێ هەڵگرین بەین لە خـرت ملـی، یـان قشـلاخ نەورۆز، یان خاناقولی.[1]

هەندێ لە ئەندامانی ڕاژە و بە تایبەت کاک ئـەنوەر ناسـری بیریـان لـەوە کـردەوە کـە زنجـیرە کـارێکی پـڕ بایـەخ ئامـادە بکـەن و وەک پرۆژەییێکی مانا و شیاو، درێژە و پەرەی پێ بدەن. جا چ لەوە باشـتر کـە ڕوویان کردە ئەدەبیات و لە ناو ئەدەبیاتیشدا ئاوڕیان دایەوە سـەر ڕۆڵـی گیانداران.

وەک دەزانین مـرۆڤ، سـروشـت و گیانـداران بـە درێژایـی مێـژوو، پێوەندییێکی ئێجگار قووڵـیان لەگـەڵ یـەک هـەبووە. ئینسـانەکان لـەم پێوندییەدا زۆر شت لە گیانداران و سروشت فێر بوون. ژیـانی مرۆڤـەکان بە بێ‌سروشت و گیاندارانی‌تر بێ‌مانایە، هەر بۆیە ئەدەبیاتیش بە بـێ ئـەو دوو دیاردەیە نەیتوانیوە بگیرسێ. سروشت و گیانداران شـان بـە شانی مـرۆڤ لـە بەشـە جۆربـەجۆرەکانی ئەدەبیاتـدا ڕەنگیـان داوەتـەوە. لـە سروشتدا کێو، باران، با، درەخت، گیا و هـەور و لـە گیاندارانیشـدا شـێر، گورگ، ڕێوی، هەڵۆ، قەل، کەر و هەندێ ئاژەڵی‌تر دەورێکـی بـەرچاویان

---

١- وەرگیراو لە کتێبی چیرۆکی فۆلکلۆری ناوچەی ئەردەلان «عەدنان بەرزنجی».

هەبووە. هەر بەم پێیە لە قۆناخی یەکەمی ئەم پڕۆژەیەدا چوار خاڵ جێی سەرنجە.

١- ئەم کارە بەرکولێکە لەم پڕۆژەیە و تەنیا داگری هەندێ چیرۆک و حەکایەت و نەقڵی فولکلۆرە.

٢- ئەم کارە لە هەندێ سەرچاوەی نووسراو وەرگیراوە و پاشان وەرگێڕدراوەتەوە سەر زمانی کوردی.

٣- ڕێوی هەمەکارەی چیرۆکەکانە.

٤- قەڵەم، قەڵەمی یەکێ لە ئەندامانی کارا و چالاکی ڕاژەیە بە ناوی ئەنوەر ناسری.

- **خودی چیرۆکەکان**

لە ئەنستیتوو ڕاژەدا خولێکی فێرکاریمان هەیە بە ناوی خولی وەرگێڕان، لەم خولە فێرکارییەدا بەو شێوەیە کار دەکەین کە سەرەتا تیئۆرییەکانی وەرگێڕان وەکوو وانە دەوترێتەوە و لە پاشان کاری وەرگێڕان وەکوو کارێکی عەمەلی دەس پێ دەکا. لە یەکێ لەو خولە فێرکاریانەدا کە ساڵی ٢٧١٢ی کوردی دەستی پێ کرد، برامان کاک ئەنوەر ناسری وەک یەکێک لەو کەسانەی کە بەشداریَ خولەکە بوو وردەوردە خۆی نواند و پەیمان بەوەی برد کە بۆ وەرگێڕان دەتوانێ کەسێکی باش بێت و باشترین دەقێکیش کە دەبێ وەریبگێڕێ فولکلۆرە. بۆیە لەسەر حەزی خۆی و داوای ئێمە ئەم کارە دەستی پێکرد؛ جا ئیتر ئەنوەر خوا بیپارێزێ ئەوەندە بەدوای کاردا دەڕوات تا

پێی دەگات، زۆر کتێبی پشکنی و زۆر لاپەڕەی دا لاوە تا ئەم چەند چیرۆکەی دۆزییەوە.

چیرۆکەکان تەنیا داگری داستانی نەتەوەیێک نین، بەڵکوو چیرۆکی کوردی، فارسی، ئازەری و... تێدا دەبیندرێ.

- **وەرگێڕانی ئەم کتێبە**

وەک ئاماژە کرا ئەم کارە تەنیا گوڵبژێرێکە لە هەندێ چیرۆک کە زۆرتر بە زمانی فارسی نووسراون و لە فارسییەوە کراون بە کوردی. زمانی وەرگێڕ لەم کارەدا زۆر ڕەوانە، بەڕاستی دەتوانم بلێم ئەو پردەی کە دەبێ لە نێوان نووسەر و خوێنەردا بێت وەرگێڕ بە باشی دروستی کردووە، لە هەمان کاتدا زمانی وەرگێڕ زمانێکی پاراو و تایبەتمەندە و بە ژیرانەترین شێوە توانیویە لە ورە و توانای قەڵەمی خۆی لە کارەکەدا کەڵک وەربگرێ.

وەک دەزانین لە کاری وەرگێڕاندا قسەی نەستەق، مەتەڵ و... ناکرێ دەقاودەق وەربگێڕدرێنەوە و دیارە وەرگێڕ دەبێ خۆی ماندوو بکات و بە دوای بەرانبەرەکەی لە زمانی پێوەردا بگەڕێ، لەم کارەدا ئەم تایبەتمەندیەمان وە بەر چاو دەکەوێ. وەرگێڕ لە زۆر شوێندا بە شێوەیێکی ژیرانە و بە بێ ئەوەی هیچ چیرۆکێک لەنگی مانا بێت کورت یان درێژایانی کردۆتەوە. کە دەڵێن وەرگێڕان هونەرە و وەرگێڕ هونەرمەند، منیش دەڵێم لەم کارەدا کاری هونەری بەدی دەکرێ.

- **ڕێوی چۆن بوو بە تووشمانەوە؟**

لـه ئـەدەبیاتی میللەتانـدا بـاوە کـە دەڵـێن ڕێـوی مەراییکـەرە و سەرچاوەی هەر داونانەوە و ئاژاوەگێڕی و پیلانێکە، لـە هـەمان کاتیشـدا کاتێ کە ڕێوی دەچێتە دڵی چیرۆکەوە تام و چێژێکی خۆش دەدات بەو داستانە و مـرۆڤ سـەرخۆش دەکـات، بـە دوای خۆیـدا ڕایدەکێشـێت و چاوەڕوانی دەهێڵێ تا بزانێ ئاکامی داستانەکە بـە کـوێ دەگـات. جگـە لەوەی کە لە فولکلۆردا ئاماژە بەوە کراوە کە ڕێوی مەراییکـەرە، جـەخت لە سەر ئەوەش کراوە کە لە حکوومەتی جەنگەڵـدا شـێر تـاج و تـەختی پاشـایەتی هەیـە و ڕێـویش ڕاوێژکـار و وەزیریـەتی. ئێمـەی نەتـەوەی کوردیش بە درێژایی مێژوو و لە هەموو سەردەمێکدا لـە لایـەن وەزیـری پادشـاکانەوە پیلانی زۆرمان بۆ گێڕدراوە و وەزیران ڕێیان خۆش کـردووە تا خونکاران هێرش بکەنە سەرمان، هـەر بۆیـە داسـتانی ڕێـوی لـە لای ئێمەدا برەوی زۆری هەیە. لـەم چەنـد چیرۆکـە لـە زۆر شـوێندا ڕێـوی پیلانگێڕ و داوبازە؛ هەندێ جاریش زۆر سـاویلکە و گێل و مەنگە.

- **وەرگێڕی ڕێوی: «ئەنوەر ناسری»**

بە ڕاستی من بۆ خۆم «ئەنوەر ناسری»م وەک هاوڕێ و هاوکارێـک زۆر خۆش دەوێ، ئای چەندە سادە و ساکارە و فارس گوتەنی: بێ شـیلە و پیلەیە. کە دەیبینم هەزار ماندوویش بم بزەم دەبـزوێ، تـا خـوا حـەز بکات گیرم پێ دەدات، ئەگەر کـاری پـێم هـەبێ لـە ئاسمـان یـان ژێـر زەویشدا بم بۆ ئەوەی کارەکەی بکەوێتە ڕێ دەمدۆزێتـەوە. جارجـار لـە دڵی خۆمدا دەڵێم ئیتر ئەمە کێیە؟! و دووبارەش دەزانم عەشق بـە کـار

وای لێ کردووه کە ئەوەندە لە سەری سوور بێت.

سوور دەزانم ئەم ئەنوەرەی کە من دەیناسم و لە خۆشەویستیدا هەر بە ئەنوەری پەتی و بێ هیچ کا و کاکە و ئا و ئاغە و نازانم... ناوی دەهێنم و دەینووسم ئەگەر نەیشێوێنێ لە خۆی لە داهاتوودا زۆری لێ دەبیسین و دەتوانێ خزمەتێکی زۆر پڕ بایەخ بە فولکلۆر و ئەدەبیات و کتێبخانەی کوردی بکات. ئەنوەر خاوەن قەڵەمێکی بەتوانایە، ڕەوان دەنووسێ، وشە دەناسێ، بە دوای واتاوەیە، ئەوەندە لە سەر ڕستە کار دەکات تا ڕێک وەک ئەوەی دەیەوێ، دایدەنێ. داوا دەکەم دوای ئەم کارە باز بداتە سەر گورگ و باقی گیانلەبەرانیتر و بەرهەمگەلێکی جوان و چڕ و پڕتر بخولقێنێ. هیوام سەرکەوتنی هەموو لایێکە. ئەنوەر و هەمووتان بە گەورەیی و نیشتمان دەسپێرم.

**عەدنان بەرزنجی**

**بەرپرسی ئەنیستیتوو زمانی کوردی ڕاژەی سنە**

**خەزەڵوەری ۲۷۱۳**

**دەسپێک:**

هەر لە منداڵییەوە زۆرم حەز لە چیرۆک و ئەفسانەی کۆن بووە، بەتایبەتی ئەو چیرۆکانەی کە سەبارەت بە گیانلەبەرانە. لە نێو گیانلەبەراندا زۆرتر ڕێویم خۆش ویستووە. ئەگەرچی بە فێڵەباز ناوبانگی دەرکردووە، بەڵام هەمیشە توانیویەتی بە کەڵک وەرگرتن لە مێشکی، بە سەر شێر، ورچ، گورگ و زۆر گیانلەبەری‌تردا زاڵ بێت. بۆیە گوتوویانە: زۆربەی کات مێشک لە زۆر و بوێری بەکارترە.

هەروا کە دەزانین فولکلۆر بنەڕەتی هەر ئەدەبیاتێکە و دەبێتە هۆی دەوڵەمەند کردنی ئەو ئەدەبیاتە. ئەدەبیاتی کوردیش یەکێک لەو ئەدەبیاتانەیە کە خاوەنی فولکلۆرێکی زۆر دەوڵەمەند و پاراوە. پاراستنی ئەم گەنجینە بەنرخە ئەرکی هەر هونەرمەندێکە.

زۆر جار کە تووشی پەند و دەستەواژەی کوردی دەهاتم، نەمدەزانی

مانایان چییه و له چ شوێنێکدا به کار دێن؛ بۆیـه بـڕیارم دا ئـەو پەنـد و دەستەواژانەی کە لە زاری خەڵکەوە بیستوومە یان لە کتێبەکانـدا چـاپ کراون کۆیان بکەمەوە و یان بەرانبـەری فارسییان بۆ دانێم یان شرۆڤەیان بۆ بنووسم کە تا ڕادەیێک توانیم لەم کارەدا سەرکەوتوو بم.

ساڵی ۲۷۱۲ لەگەڵ چەند کەس لە ئەندامانی ئەنجومـەنی ئـەدەبی مەولەوی شاری سنه، لقی فولکلۆرمان لە ئەنجومەندا دامەزراند.

سەرەتا کینایەکانی «فەرهەنگی خاڵ» و «هەنبانە بۆرینـە»مان جوێ دەکردەوە و بەرانبـەری فارسیمان بۆی دادەنا.

بە داخەوە ئەم کارە ناتەواو مایەوە و نەگەیشـتە ئـەنجام، بـەڵام بـۆ خۆم بەردەوام لە سەر فولکلۆر کارم کرد تا گەیشـتمە ئـەو بڕوایـە دەبـێ ئەم پەند و دەستەواژانە لە چیرۆکدا بەکار بێنم.

بە ڕای خۆم کەڵک وەرگرتن لە فولکلۆر لە نێـو وەرگێڕانـدا دەبێتـە هۆی جوانتر کردنی بەرهەمەکە. هەر بۆیە دەستم کرد بە کۆکردنـەوەی ئەو چیرۆکانەی کە سەبارەت بە گیانلەبەرانە و بۆ ئەم مەبەسـتە سـەرەتا ڕێویم هەڵبژارد.

زۆربەی ئەو پەند و دەسـتەواژانەی کـە لـەم چیرۆکانـەدا بـە کـارم هێناوە لە زاری خەڵکەوە بیستوومە و هێندێکیشی لە کتێبەکانـدا چـاپ کراون.

دەقی چیرۆکـەکان بـە زاراوەی سـۆرانی یـان موکریانییـە و پەنـد، دەستەواژە و هەندێ لە وشەکان هی زاراوەکانی‌ترن. لەوانەیە ئـەم کـارە بکەوێتە بەر لێشاوی ڕەخنەگرانەوە، بەڵام تا ئەو جێیەی توانیومە هەوڵـم

داوه بە باشترین شێوە کەڵکیان لێ وەربگرم.

لە دواییدا زۆر سپاسی ئەم هاوڕێیانە دەکەم کە لەم بوارەدا یارمەتیان دام بۆ ئەوەی بەرهەمێکی جوان و چڕوپڕ بخولقێنم: نەجمەدین شەوکەتیاریان، ڕەشید مورادی، جەمال فەتحی، سەحەر موعێزی، ئاری عەبدی، سەمیرا ڕەشنەواز، ئەنستیتوو ڕاژە و ئەنجومەنی ئەدەبی مەولەوی.

ئەنوەر ناسری

سنە ٢٧١٣

**تێبینی:**

**جامقولیباز:** ئەم وشەیە لە ڕاستیدا «جامبازقولی»یە، بەڵام بە هۆی گۆڕانکارییێک کە بە سەریدا هاتووە بووەتە جامقولیباز. وشەییێکی لێکدراوە کە لە جامباز + قولی پێکهاتووە. قولی: وشەییێکی مەغۆلییەکە بە مانای غولامە و لە کوردیدا زۆرتر بە مانای شاگرد دێت.

جامباز: لە دەستەواژەی کوردیدا بە مانای فرۆشیاری ئەسپ و ولاخ هاتووە. ئەم جامبازانە بۆ ڕەچاوکردنی ڕەسەنترین ئەسپ یان ولاخ بە شار و گونددا دەگەڕان. لە هەر کوێدا ئەسپ یان ولاخێکی ڕەسەنیان دەبینی دەچوونە خزمەتی خان و بەگەکان و ڕایاندەگەیاند کە ئەسپێکی ڕەسەن لە فلانە شار یان گوند هەیە. بەمجۆرە لەم ڕێگەیەوە پارەییێکیان بە دەست دەهێنا. ئەم جامبازانە بەرەبەرە بە زیرەک و فێڵەباز و یارمباز ناوبانگیان دەردەکرد. لە بەر ئەوەی لە کاری فاڵدانی ئەسپدا

شارەزارییێکی باشیان پەیدا دەکرد و چونکە برێ جار هەندێک لە ئەسپەکان کە بە ڕواڵەت ڕەسەن بوون، بەلام هەر کە دەگەیشتنە نێو ئاو سوارەکەی خۆیان دەگلاند، دەیانگوت ئەم ئەسپە لە ئاودا دەخەوێ یانی ڕەسەن نیە. ئەم بابەتە لە بارەی ژنان و کچانیشەوە بەکار دەهات. بۆ وێنە ئەگەر کچ یان ژنێک باش نەبوایە، دەیانگوت لە ئاودا دەخەوێت. هەر بۆیە بە هۆی ئەم شوناسە تایبەتیانەوە بە یارمباز و فێڵەباز ناوبانگیان دەردەکرد.

ئەم زانیارییانەم لە بەڕێز نەجمەدین شەوکەتیاریانەوە وەرگرتووە.

# گورگ و ڕێوی

**کۆکردنەوەی: سەیدئەبولقاسم ئەنجەوی شیرازی**

ڕێوییێک لە نێو باخێکدا دەژیا. باخەکە هی پادشا بوو و گ شەوێ دەستی ئەکردە خواردنی میوەکان و هێندێکیشیانی خراپ دەکرد. باخەوان پێی زانی و کەوتە بیر ڕێگەچارەیێک. چونکە گەر پادشا بیزانیبایە شەقێکی تێ هەڵئەدا و دەری دەکرد. بۆیە تەڵەیێکی بۆ نایەوە و پلێ دووگیشی بۆ دانا. شەو کە ڕێوی لەو نێوەدا دەخولایەوە، دووگەکەی بینی. تۆزێ ڕاما و لە بەرخۆیەوە وتی:

- ئەگەرچی خودا ڕزقی هەموومان ئەدا، بەڵام لە کولانەوە بۆمان ناخاتە خوارەوە. بێت و نەبێ ئەم ماستە بێ موو نییە.

لە باخەکە دەرچوو و ڕۆیشت هەتا گورگی دۆزییەوە. سەیری کرد زوانی کەوتووەتە لای دەمی و لە سەر عەردێ کەوتووە. گورگ تا چاوی کەوتە ڕێوی وتی:

- مام ڕێوی زۆرم برسییە، هیچ شتێ شک نابەیت؟

ڕێوی سڵاوی کرد و وتی:

- تا ئێستە لە پرسەدا بووم و هێشتێ شێوم نەخواردووە. وەرە با برۆین.

گورگ شاگەشکە بوو و پێکەوە بەرەو باخەکە کەوتنە ڕێ. کە گەیشتنە نێو باخەکە، هەڵمەتی بۆ دووگەکە برد و بووە تەڵەوە. دووگەکەیش کەوتە بەردەم ڕێوی. ئەویش هەڵیگرت و هەڵات.

گورگ:

- ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟

ڕێوی:

- ئەمە بەشەکەی من بوو.

گورگ:

- ئەی من؟!

ولامی دایەوە:

- ڕاوەستە تا باخەوان دێت.

سەرلەبەیانی باخەوان گورگەکەی بینی. بێلاسنێکی هەڵگرت و کام لات دێشێ کوتای. ئینجا تەڵەکەی کردەوە و تووڕی دایە دەرەوە. گورگ دوای ماوەیێک گیانێکی پێدا هاتەوە و بۆی دەرچوو.

ڕێوی کە دەیزانی گورگ تۆڵەی لێ دەکاتەوە، چووە نێو دوکانی خومچییێکەوە. کلکی خستە نێو ڕەنگی شین، گوێچکەی خستە نێو ڕەنگی زەرد و تەمادەر گورگ بوو. گورگ لە دوورەوە هاواری کرد:

- جامقولیباز کە هاتم «کتک ئەخەمە شواڵت».

ڕێوی گوتی:

- فلته فلت، قسەی دەمت بفامه. ئەو کەسەی فێڵی لێ کردووی من نیم، من خومچیم.

گورگ گوتی:

- بمبووره. تکایه خومگەریم فێر بکه با کاسبی پێوه بکەم.

ڕێوی گوتی:

- فێرت ئەکەم بەو مەرجەی خۆت کەر نەکەی.

که چوونه سەر کووپەکان ڕێوی گوتی:

- دەستت بخەره نێو ڕەنگەکه با فێر ببیت.

هەر کە نووشتایەوه ڕێوی پاڵی پێوه نا و خستیه نێو کووپەکەوه. سەرەکەی نایەوه و دەرچوو.

بەیانی که خاوەن دوکانەکه هات سەیری کرد گورگێک کەوتووەته نێو کووپەکەوه. دارێکی لێ هەڵگرت و ئەوەندەی لێدا ناو خوای له بیری بردەوه.

لەو لاشەوه ڕێوی کوتێ چەرمی دۆزییەوه. سووژنێکی هەڵگرت و دەستی کرده دووراندن. گورگ تا چاوی پێکەوت گوتی:

- قورمساخ «شەرت بێ کەڵەمەت بجەڕنم».

ڕێوی:

- چیه، دەڵێی نان هاریت گرتووەته دەمەوه. چم له تۆ داوه من پیاوێکم پینەچی.

گورگ:

- بمبووره نەمزانی. تکایه جووتێ پێلاوم بۆ دروست بکه بۆ ئەوەی له هاویناندا پاگەلم نەسووتێ.

ڕێوی:

- باشە، بڕۆ پەزێک و تۆزێ قیرم بۆ بێنە.

گورگ چوو پەزێکی ڕفاند و گەیشتە پیرەمێردێک. کوشتی و لە نێو کەشکۆلەکەیدا نەختێ قیری دزی و هاتەوە لای ڕێوی.

ڕێویش گوتی:

- بڕۆ سبەینێ وەرەوە.

بەیانی کە گورگ هاتەوە بۆ کەوشەکانی، ڕێوی پێی وت:

- ژێرە و بانەکەی ماوە. پەزێکیتر بێنە.

گورگیش چوو پەزێکیتری بۆ هێنا.

بەمجۆرە ڕێوی هەموو ڕۆژێ دەسەسەری ئەکرد و خۆی تێری ئەخوارد. لە دواییدا کارەکەی تەواو کرد. گورگ پێلاوەکانی لە پێ کرد و کەوتە ڕێ. دەمەو نیوەڕۆ قیرەکە توایەوە و جوولەی لە گورگ بڕی.

شوانەکان کە گورگیان بینی گەلەکۆمەیان لێ کرد و ئەوەندەیان لێیدا بای باڵیان بڕی. لەو لاشەوە ڕێوی بڕێ شوولی کۆ کردەوە و دەستی کرد بە سەوەتەچنین.

گورگ کە چاوی کەوتە ڕێوی هاواری کرد:

- قوڕمساخ، «شەرتبێ بتخەمە شوێنێک خۆر بە چاو نەبینی».

ڕێوی:

- ترەتری چیتە؟ بەرودوای قسەی خۆت بفامە. من سەوەتەچنم و ئەو فێڵەباز.

گورگ:

- دەبێ بمبووری نەمزانی. سەوەتەیێکم بۆ دەچنی؟

ڕێوی سەوەتەیێکی چنی و پێی وت:

- بچۆرە ناوی بزانە چۆنە.

هەر کە گورگ چووە نێو سەوەتەکە، ڕێوی شەتەکی دا و لە تەپۆلکەیێکەوە خلێری کردەوە. شوانێک چاوی پێ کەوت. بردیەوە ماڵێ و بە دایکی وت:

- ئەم هەنگوێنە هەڵگرە بۆ جێژن.

هەر کوڕەکەی چووە دەرێ، «قاسۆی کێشا». کە زانی ڕۆیشتووە نانێکی هێنا و ویستی کەمێ هەنگوێن بخوا. کە دەستی کردە کونی سەوەتەکەدا گورگ قەپی کردە دەستی پیرەژنەکەدا. لە پڕێکدا هاواری لێوە هەستا. کوڕەکەی و جیرانەکان خۆیان گەیاندێ. دەورەیان دا و ئەوەندەیان لێ دا خستیانە سەرەمەرگەوە.

ڕێوی کە دەیزانی چ پەنێکی داوە، چووە نێو ئاشێکەوە. سەر و ڕووی خۆی نیا ئارد و لە کولەسووچێکەوە دانیشت. گورگ هەر لە دوورەوە قیڕاندی:

- سەگباب، تا چەرمت ڕەق نەکەم وازت لێ ناهێنم.

ڕێوی:

- گەوجە گەوج. من ئاشەوانم و کارم بە کەسەوە نیە.

گورگ:

- تکایە بمبوورە. وەمزانی تۆ ئەو ڕێوییەی کە کڵاوی سەر کردم. تکایە ئاشەوانیم فێر بکە.

ڕێوی:

- قەیدێ ناکا دەتبەخشم. بەخشین لە گەورەیە و گوناح لە بچووک. وەرە

با فێرت بکەم.

دەستی خستە ژێر بەرداشەکە. گورگ جوولەی لێ برا. ڕێویش لە پشتەوە بەربووە گیانی. کە کاری خۆی کرد بۆی دەرچوو.

سەر لە بەیانی کە ئاشەوان هات گورگی بینی. بەردێکی هەڵگرت و ئەوەندەی لێ دا تۆپی.

جۆزەردان ٢٧١٣

**سەرچاوە:**

**١- فرهنگ افسانەهای مردم ایران، جلد ۶، صص ٢٥٥-٢٥١.**

# ڕێوی بەرگدوور[1]

**نووسینەوە: فەرەجوڵلا خوداپەرەستی**

ڕێوییێک هەبوو ئەوەندە فێڵی لە خەڵک کردبوو «کەس گووی بە کڵاوی نەدەپێوا». لە لایێکیتریشەوە تەنگ و چەڵەمەی ژیان تەنگی پێ هەڵچنیبوو، بۆیە بیرێکی بە مێشکدا هات. دوو کوڕی هەبوو یەکیان ناوی سەندەل و ئەویتریان مەندەل بوو. بانگیانی کرد و گوتی:

- گوێ بگرن بزانن دەڵێم چی. لەمڕۆ بە دواوە دەچنە هەر شوێنێک دەبێ بڵێن باوکمان بەرگدوورە و هەموو چەشنە جلوبەرگێک دەدوورێ و هەتا دەتوانن بازاڕگەرمیم بۆ بکەن.

کوڕەکانی گوتیان:

- دڵنیا بە هەر بەو جۆرەی کە وتت وا دەکەین.

---

[1] - فولکلۆری باشووری ئێران.

ڕۆژی دوایی کەوتنە ڕێ و تووشی هەر کەسێک دەهاتن پێیان دەگوت:

- باوکمان بەرگدوورە و دوکانەکەی لە فلان شوێنە.

یەکەمین کەسێک کە چووە لای ڕێوی، گورگی ساویلکە بوو. دوای چاک و چۆنی گوتی:

- وەستا ڕێوی! هەروا کە دەزانی زستان هەوای ساردە و منیش وردەوردە بەرەو پیری دەچم. هاتووم بزانم گەر فەرەنجییێکم بۆ بدووری چەندی تێ ئەچێت؟

ڕێوی کە کەر خۆی دۆزیبووەوە، وڵامی دایەوە:

- ئامۆزا گیان، ئەوە چ قسەیێکە. بە داخەوە خورییەکانم تەواو بووە ئەگینا یەکێکم بۆت دەدووری و دەمهێنایە خزمەتت.

گورگ گوتی:

- دە ئێستە چارمان چیە؟

ڕێوی گوتی:

- لەو خوارە لە پشتی تەپۆلکەیێکەوە شوانێک بەرانێکی زۆری هەیە. بڕۆ حەوت دانەیان بڕفێنە. خورییەکانیان دەقاچمەوە، منداڵەکان دەیڕێسن و فەرەنجیەکەت بۆ ئەدوورم.

گورگ خۆشحاڵ بوو و گوتی:

- خوا ڕاوەستاوت بکا. بەڕاست چەند ڕۆژی تێ ئەچێت؟

نەختێ تێفکری و گوتی:

- ئەگەر بەرانەکان زوو بهێنی چواردە ڕۆژ دەبات.

گورگ گوتی:

- دڵنیا بە، ئینجا ماڵاوایی کرد و ڕۆیشت.

گورگ بەڵێنەکەی بردە سەر و هەموو ڕۆژێ یەک- دوو بەرانی بۆ دەهێنا. لەو ڕۆژە بە دواوە نانیان کەوتە نێو ڕۆن و وەک کورد ئەڵێ: «خواگەرەکی بێت ڕزق قالاوێ بگەینێ کەرێکی بۆ ئەتۆپێنێ». کەر خۆیان چنگ خستبوو و فێری کوڕەکانی دەکرد کە چ بکەن و چ نەکەن.

چواردە ڕۆژەکە تەواو بوو و گورگ چوو بۆ دوکانی ڕێوی. ڕێویش دەستی کردە تاریف کردن لە فەرەنجیەکە و گوتی:

- تەنیا دوگمەکانی ماوە. ئەوەیشم داوەتە ژنەکەم دروستی بکات.

ئینجا چاوێکی لە سەندەل داگرت و گوتی:

- کوڕم، بچۆرەوە ماڵێ. ئەگەر دایکت دوگمەکانی دروست کردبوو لەگەڵ خۆتا بیهێنە.

سەندەلیش کە دەیزانی چ بکات کەوتە ڕێ. دوای سەعاتێک هاتەوە و گوتی:

- کەس لە ماڵەوە نەبوو. پێم وایە چووبێتە ماڵی پوورم. گەر لەوێ بێت تا شەو ناگەڕێتەوە.

ڕێوی داوای لێبوردنی لێ کرد و هەر جۆرێ بوو دەسەسەری کرد. ئینجا پێی وت:

- برۆ حەوت ڕۆژیتر بێرەوە.

گورگ هیچ چاری نەبوو. دوای حەوت ڕۆژ خۆی کردە دوکانی ڕێویدا و داوای فەرەنجییەکەی لێ کرد. ڕێوی کە پەشۆکابوو لە پرێکدا گوتی:

- فەرەنجییەکەت ئامادەیە.

خراپ جۆرێ گیری کردبوو و ڕێگەی بەر و دوای لێ بڕا بـوو. لـە ناچاریـدا ڕووی کردە مەندەڵ و گوتی:

- بچۆرەوە ماڵێ و فەرەنجییەکـەی مامـت بێنـە. فەرەنجییەکـەم لـە نێـو بوخچەیێکی زەرد و لە سەر تاقەکە داناوە. نەکەی دڕەنگ بیتەوە.

گورگ هـەرچی چەمـەڕا بـوو مەنـدەڵ نەگەڕایـەوە. کـە سـەیری ڕەنگـە پەڕیوەکەی ڕێوی کرد، زانی شتێک قەوماوە و دەستی کردە خوتە و بۆڵە.

ڕێوی کە زانی بارودۆخەکە ئاڵۆزە خوڕییە مل سەندەڵدا و گوتی:

- زوو بڕۆ فەرەنجییەکە بێنە و بزانە ئەو تیربۆگەییە لە کوێیە.

ماوەیێک ڕابرد و نەهاتەوە. ڕێوی کە دەیویست خۆی دەربـاز بکـات ڕووی کردە گورگ و گوتی:

- دەبینی برا؟! دڵم خۆشە کوڕم گەورە کردووە. کەس بـۆ کـەس نـامرێ. تۆزێ ڕاوەستە تا بڕۆم بیهێنم بۆت.

گورگی ساویلکە ماوەیێکی زۆر چاوەنواڕی کێشا. کـە زانی چ فێڵـێکی لـێ کراوە، چاوی پەڕییە تەوقی سەری. بە تووڕەییەوە بەرەو کولانەی ڕێـوی کەوتـە ڕێ.

هەر کە گورگی بینی لە ترسا خۆی کردە کولانەکەیدا.

گورگ خۆی گەیاندە بەر کولانەکەی و قیڕاندی:

- قوڕمساخ، وات لێ هاتووە فێڵم لێ دەکەی. وەرە دەرەوە بزانم.

ڕێوی بە گورجی لە کولانەکەی دەرپەڕی و لە ژێر دەست و پـای گورگـەوە بۆی دەرچوو، ئەویش دوای کەوت.

ڕێوی کە دەیزانی چ پەنێکی داوە، خۆی گەیاندە بیرێک. لە سـەر بیرەکـە

دوو دۆلچە هەلواسرا بوو. خۆی خستە نێو یەکێ لە دۆلچەکان و چووە خوارەوە. گورگیش خۆی گەیاندێ و گوتی:

- فێلەباز ئەمجارە دەرچوونت بۆ نییە.

ئینجا چووە نێو دۆلچەکەی‌تر و چووە خوارەوە. هەر کە گورگ چووە خوارێ ڕێوی چووە سەر و هەلات. خۆی گەیاندەوە مالێ و بەسەرهاتەکەی بۆیان گێڕایەوە.

گورگی کلۆل هەر وا لە نێو بیرەکەدا مابووەوە؛ تا ڕۆژێک شوانەکان هاتن بزنەکانیان ئاو بدەن. یەکێ لە شوانەکان کە گورگە نیوەگیانەکەی بینی بە هاوڕێیەکەی وت:

- ئەمە هەر ئەو گورگەیە کە حەوت بەرانەکەی لێ ڕفاندووین.

بە هەر گیان‌کەشتێ بوو گورگەکەیان لە نێو بیرەکە دەرهێنا و داخی دلی خۆیان و داریان دا بە ڕۆحیا.

پووشپەڕ ۲۷۱۳

**سەرچاوە:**

**١- فرهنگ افسانه‌های مردم ایران، جلد ۶، صص ۱۷۴-۱۶۹.**

# ئاشەوان و ڕێوی[1]

**کۆکردنەوە و وەرگێڕان: حسێن داریان**

ئەحمەد ئاشەوانێک هەبوو کە لە بەردەم ئاشەکەیدا دارهەرمێیەکی چاندبوو. لەو دەور و بەرەدا ڕێوییێک هەبوو کە هەرمێیەکان دەگەیشتن دەهات و یەکێکیانی دەکەندەوە و دەیخوارد. ڕۆژێک ئەحمەد کولەی گرت تا بزانێ کاری کێیە. لە ناکاو ڕێوییێکی چاوپێکەوت کە هات و یەکێک لە هەرمێیەکانی خوارد و بۆی دەرچوو. لە بەر خۆیەوە گوتی:

- ئەمە وا نابێت. دەبێ چارەیێکی بۆ بدۆزمەوە. باشتر وایە کاسەیێک قیر بە دارەکەدا بکەم بۆ ئەوەی ڕێوی بگرێت. کاسەیێک قیری هێنا، تواندیەوە و پژاندیە دارەکەدا. لە ناکاو ڕێوی ئاسەلا بوو. کە چووە سەر دارەکە، جوولەی لێ بڕا. سەر لە بەیانی ئاشەوان هات. ڕێوی پاڕایەوە و گوتی:

---

١- فولکلۆری ناوچەی ئازەربایجانی ئێران.

- توخودا ڕزگارم بکە.

ئاشەوان گوتی:

- گیانیشت دەرچێ ڕزگارت ناکەم. تەواوی هەرمێیەکانمت خواردووە و مالوێرانت کردووم.

ڕێوی پێی وت:

- تۆ ڕزگارم بکە، هەر ئاواتێکت هەبێ دەیهێنمە دی.

لە دواییدا دلی نەرم بوو، چوو نەفتی هێنا و قیرەکانی پاک کردەوە. ئینجا گوتی:

- دەتوانی بڕۆی.

ڕێوی گوتی:

- بۆ هیچ شوێنێ ناچم. دەبمە خوشکەزای تۆ تا بزانم چ ئاواتێکت هەیە.

پێکەوە چوونە نێو ئاشەکەوە. پاش ماوەییێک گوتی:

- خالە، دەمەوێ بڕۆم کچی پادشات بۆ خوازبێنی بکەم.

ئاشەوان ولامی دایەوە:

- هەر باسی مەکە. من لە کوێ و کچی پادشا لە کۆی؟

ڕێوی گوتی:

- تۆ کارت نەبێ. دەچم ئەگەر دایان، چ خاستر، ئەگەریش نا «خو دایکی کراس کەوگ نەمردووە».

ڕێوی پێشتر کەمێ ئالتوونی دۆزیبووەوە و لە شوێنێکدا شاردبوویەوە. ڕۆیشتە دەرباری پادشا و گوتی:

- ئەو سەنگی محەکەم بدەنێ زێڕەکانمی پێ محەک بدەم.

ڕێوی سەنگی محەکی وەرگرت و ڕۆیشت. پاش ماوەیێک سەنگی محەک و ئەو زێڕەی کە دۆزیبوویەوە بردەوە دەربار.

خزمەتکارانی پادشا کە ئاڵتوونەکەیان بینی، سەریان سووڕما و گوتیان:

- سەیرکە چەندە دەوڵەمەندە کە ئەو زێڕە بەنرخەی لەگەڵ سەنگی محەکدا بۆ هێناوین.

پادشایش گوتی:

- بە دڵنیاییەوە زۆر دەوڵەمەندە.

دوای چەند ڕۆژ ڕێوی هاتەوە و بە خزمەتکارانی پاشای گوت:

- خاڵۆیێکم هەیە دەیەوێ کچی پادشا بخوازێ. گەر پێتان خۆشە دەیهێنمە خزمەتتان. ئەگەر یەکتریان بە دڵ بوو پێکەوە زەماوەند بکەن.

چوون ئەمەیان بە پادشا گوت. پادشا وەڵامی دایەوە:

- قەیدێ ناکا، کچەکەم هەر دەبێ شوو بکا ئەمە نەبێ یەکێکی تر.

ڕێوی چوو بە ئەحمەدی گوت:

- وەرە پادشا ڕازی بووە کچەکەی ببینی.

ئینجا گوتی:

- تەنیا دەستێک جلوبەرگت پێویستە. چیت بۆ بدۆزمەوە کە کچی پادشا حەزی لێ بێت؟

ئەحمەد گوتی:

- ئەوە کاری خۆتە.

وەرە برۆینە نێو ئاشەکەوە تا بیرێکی لێ بکەمەوە. کە چوونە نێو، لیباسەکانی داکەند و وتی:

- لە سەر ئەو بەردە دانیشە تا دێمەوە.

ڕێوی کەسێکی ناردە دەرباری پادشا و وتی:

- زاوا خەریک بوو مەلەی دەکرد، جلەکانی ئاو بردی. تکایە دەستێک جلوبەرگم بدەنێ تا بۆی بەم.

پادشا ڕووی کردە کچەکەی و وتی:

- دەستێ جلوبەرگی زاوایەتیم بۆ بێنە.

ئەویش دەستێ جلی جوانی هەڵبژارد و دایە خزمەتکارەکەی بۆی بات.

ئەحمەد لیباسەکانی لە بەر کرد و لەگەڵ ڕێوی بەرەو کۆشکی پادشا کەوتنە ڕێ. پادشا کە ئەحمەدی بینی، زۆر چووە دڵیەوە. دوای نانی نیوەڕۆ پادشا وتی:

- ئەگەر ڕێگا بدەن مەلا بێت و مارەیان بکات.

مەلا مارەیانی کرد و ڕێوی گوتی:

- مانگێکی‌تر دەیگوێزینەوە.

لە نێو ڕێگادا ڕێوی لێی پرسی:

- خالۆ، بە ڕاست کە کچەکەمان گواستەوە بیبەینە کوێ؟

ولامی دایەوە:

- بە خوا چووزانم. خۆت دەبێ کارێک بکەی.

پێکڕا چوونە نێو هۆزێکەوە و ڕەشماڵێکیان بەکرێ گرت. ئینجا وتیان:

- ماوەیێک لێرە دەمێنینەوە تا بزانین دوایی چ دەبێ.

دوای مانگێک ڕۆیشتنە خزمەت پادشا و کچەکەیان گواستەوە. پادشایش خەڵاتیکی زۆری بۆ کچەکەی کۆ کردبووەوە. ڕێویش گەیشتبووە هەر کەسێ

ڕایسپاردبوو کە هەر کەسێ پرسیاری کرد ئەم مەڕانە هیێ کێیە؟ بڵێن: هی ئەحمەد ئاغایە. ئەم باخ و باخاتە هی ئەحمەد ئاغایە. لە هەر کووچە و کۆڵانێکدا کە تێدەپەڕین هەموو شتێ هی ئەحمەد ئاغا بوو. بەختی هێنا بوو، دەستێک جلی نەبوو لە بەری بکا، بەڵام هەموو شتێ بە ناویەوە بوو.

ئەم هەواڵەیان گەیاندە پادشا و وتیان:

- زاواکەت ئەوەندە دەوڵەمەندە کە داراییەکەت لە بەرانبەر داراییەکەیدا وەکوو دڵۆپێک لە بەرامبەر زەریاییکە.

پادشا کە ئەمانەی بیست وتی:

- پێویست ناکا لێم دوور کەونەوە. بڕۆن بیانگێڕنەوە دەمەوێ لە لای خۆم بمێننەوە.

تاج و تەختەکەی بەخشیە ئەحمەد و خۆی بووە وەزیری. ڕێوی ماڵاوایی لێ کرد و ڕۆیشت. ئەوانیش بە خۆشییەوە ژیانیان بردە سەر.

پووشپەڕ ٢٧١٣

**سەرچاوە:**

**١- فرهنگ افسانەهای مردم ایران، جلد ۶، صص ٢٨٥-٢٨١.**

# ڕێوی دارتاش[1]

**کۆکردنەوە: سەیدحسێن میرکازمی**

قشقەڕەیێک لە سەر دارێکەوە هێلانەی کردبوو و سێ زەڕنەقووتەی هەبوو. ڕۆژێک ڕێوی لەوێوە ڕادەبرد کە قشقەڕەکەی بینی. خۆی گەیاندە پای دارەکە، تۆزێ ناوچاوی تورشاند و پێی گوت:

- برسیمە.

قشقەڕە گوتی:

- دەی چ بکەم؟

ڕێوی گوتی:

- یانی چی؟ زووکە یەکێ لە زەڕنەقووتەکانتم بۆ فڕێ دە خوارەوە، ئەگینا بە کلکم دارەکە دەبڕمەوە و هەمووتان دەخۆم.

---

١- فولکلۆری باکووری ئێران

قشقەڕەکە ترسا و یەکێ لە زەڕنەقووتەکانی خستە خوارەوە و ئەویش هەلمەقووتی کرد. ڕۆژی دوایی هەمیسان خۆی گەیاندە پای دارەکە و گوتی:

- ئەم دارە هی منە، یەکێ‌تر لە زەڕنەقووتەکانتم بەرێ ئەگینا دارەکە بە کلکم دەبڕمەوە. قشقەڕەکە بە نابەدڵییەوە یەکێ‌تر لە زەڕنەقووتەکانی خستە خوارەوە و تەنیا یەک دانەی بۆ مایەوە.

ڕۆژی دواتر دیسان ڕێوی لێی ئاسەلا بوو و وتی:

- زووکە خواردنی ئەمڕۆشم پێ بدە ئەگینا دارەکە دەبڕمەوە.

قشقەڕەکە لە بەر خۆیەوە وتی:

- باشتر وایە بڕۆم دەگەڵ قالاودا ڕاوێژێ بکەم، بزانم دەڵێ چی.

دیسان ڕێوی وتی:

- بیرکردنەوەی ناوێ. خێرا کە.

ولامی دایەوە:

- ڕاوەستە با لە خەو هەلیسێنم و خواردنی پێ بدەم.

ڕێوی وتی:

- باشە، بەلام زوو کە تا تووڕە نەبووم.

ئەمەی وت و لە ژێر دارەکەدا ڕاکشا و خەوی لێ کەوت.

قشقەڕەکە بە ئەسپایی هەلفڕی، خۆی گەیاندە لای قالاو و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. قالاو کە ئەم قسەیەی ژنەفت، وتی:

- بۆ ئەوەندە کلۆلی. خۆ کلکی ڕێوی مشار نییە دارەکە ببڕێتەوە. بچۆ پێی بلێ ئەوەندە کلکی بە دارەکەدا بهێنێ تا گیانی دەرئەچێ.

قشقەڕەکە گورجێ خۆی گەیاندەوە هێلانەکەی، کە دەنگی ڕێوی بەرز

بووەوە:

- دەرفەتەکەت تەواو بوو.

قشقەڕەکە بە تووڕەییەوە وڵامی دایەوە:

- قوڕمساخ ئەوەندە کلکت بە دارەکەدا بێنە تا گیانت دەرئەچێ.

وڵامی دایەوە:

- دارەکە ببڕم یان زەڕنەقووتەکەت دەخەیتە خوارەوە؟

قشقەڕە وتی:

- لە بەر چاوم دوور کەوە.

ڕێوی چەقۆت لێ بدا خوێنی دەرناهات، کە وای بینی وەدوای کاری خۆی کەوت و لە باخەکە چووە دەرێ.

چەند ڕۆژێک نەگەڕایەوە باخەکە. تا ئەوەی کە ڕۆژێک لە پشتی پەرژینی باخەکەوە خۆی مەڵاس دابوو، بۆی دەرکەوت کاری قالاوە دێت و دنەی دەدات. ئاگری تۆڵە لە دڵیدا گەشەی سەند و ویستی قالاو لە ناو بەرێت.

خۆی ژەندە ئاوا و چەند جارێ لە نێو خۆڵدا خۆی خولپاندەوە و لە پای ئەو دارەی کە قالاو لە سەری هێلانەی کردبوو خۆی کردە تۆپیو.

قالاو کە گەڕایەوە هێلانەکەی، ڕێوی لەو حاڵەدا بینی. کە زانی تۆپیوە، زۆر کەیفخۆش بوو، لە سەر کەلاکی نیشتەوە تا لە تۆڵەی قشقەڕەدا چاوانی دەربێنێ. لە ناکاو ڕێوی قەپی داوەشاند و گرتی. وتی:

- ئەتخۆم و تۆڵەت لێ دەسێنمەوە.

قالاو کە هیچ هیوایێکی نەمابوو وتی:

- قەیدێ ناکا بمخۆ، بەڵام...

لێی پرسی:

- بەڵام چی؟

قالاو گوتی:

- باوباپیرانت کاتێ باوباپیرانی منیان دەخوارد فاتحایێکیان دادەخست. پێم وایە تۆیش ئەوەت لە بیر بێ؟

ڕێوی گوتی:

- ئەی چۆن.

قالاو گوتی:

- دە باشە من ئامادەم.

هەر کە ڕێوی ویستی فاتحا بخوێنێ، قالاو هەڵفڕی و ڕزگاری بوو. ڕێوی دەمی داچەقیا. قالاو ڕیقنەیێکی داکرد و گوتی:

- ئەوەش بخۆ و هەڵیگرە بۆ حەوت پشتت.

پووشپەڕ ۲۷۱۳

**سەرچاوە:**

**١- فرهنگ افسانه‌های مردم ایران، جلد ۶، ۱۶۴-۱۶۱.**

# ڕێوی و پشیلەی زیتەڵە[1]

**کۆکردنەوە: عەلی ئەشرەف دەرویشیان**

جووتیارێک هەبوو لەماڵەوە مشک تەنگی پێ هەڵچنیبوو. هەر جارەو پشیلەیێکی دەهێنا، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو. ڕۆژێک چووە لای هاوڕێیکی و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

هاوڕێیەکەی وتی:

- پشیلەییکم هەیە لە دنیادا بێوێنەیە. بۆتی دەهێنم.

جووتیارەکە پشیلەکەی بردەوە ماڵێ. ڕۆژێک کە لە درزی دەرگاکەوە دەیڕوانی، بینی کە نە تەنیا مشکەکان ناگرێت بەڵکوو لەگەڵیشیاندا یاری دەکات. خستیە نێو تەلیسێکەوە، بردیە دارستانێک و بەرەڵای کرد.

پشیلە لەو نێوەدا بوو کە چاوی کەوتە ڕێوی.

---

١- فولکلۆری ناوچەی کرماشان (بێستوون) بەڵام بە زمانی فارسی بلاو بووەتەوە.

ڕێوی هاتە لای و وتی:

- لێرە چ دەکەی؟

پشیلە بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

ڕێوی وتی:

- وەرە مالی مَن.

پشیلە وتی:

- مالەکەت لە کوێیە؟

ڕێوی ولامی دایەوە:

- زۆر دوور نییە، لە پشت ئەو دارانەوەیە.

پێکەوە کەوتنە ڕێ. دوو ڕۆژ هیچ نەبوو بخۆن.

پشیلە بە ڕێوی وت:

- وەک کورد ئەلێ «سک برسی خوا ناناسێت». دەبێ چ بکەین؟

ڕێوی لە ولامدا وتی:

- بیرێکی زۆر باشم کردووەتەوە.

پشیلەکە وتی:

- دەپێم بلێ، بیرەکەت چییە؟

ڕێوی چوو، لە ناکاو تووشی ورچێک هات. ویستی دەرچێت کە ورچ وتی:

- براله، بۆ هەلدێی؟ دەمێکە لە نێو ئەم دارستانەدا دەژین و هیچ کێشەیێکمان لە نێواندا نەبووە.

ڕێوی ولامی دایەوە:

- بەلێ وایە، بەلام پلینگێکمان تووش بووە و داوای کەرانەمان لێ دەکا.

ئێمەش لە گون گا ڕووتترین.

ئینجا لە پرمەی گریانی دا. ورچ گوتی:

- پلینگ داوای چیتان لێ دەکا؟

ڕێوی گوتی:

- وەللاهی بزنی لێمان دەوێ.

ورچ گوتی:

- مەگری، لە ڕۆژی دیاریکراودا هەرچیم ببێت بۆتی دێنم تەنیا بلێ بیهێنمە کوێ؟

- بیهێنە ژێر داری تەنیشت مالەکەم. ئاگادار بە نەیتە پێشەوە چونکە زۆر توورەیە.

ئینجا مالاوایی لێ کرد. گەڕایەوە لای پشیلە و قسەکانی بۆ گێڕایەوە. پشیلەکە وتی:

- گورگیشت بینی؟

- هێشتا نەمبینیوە.

- بچۆ بۆ لای گورگ و لەگەڵ ئەویشدا قسە بکە. ڕەنگە بتوانێ شتێکمان بۆ بێنێ.

ڕێوی ڕۆیشت هەتا گورگی دۆزییەوە. کە چاوی پێ کەوت وتی:

- کەری کوێ تۆپیوە کەوتیتە بیر ئێمە؟

ڕێوی ولامی دایەوە و وتی:

- وەللاهی ماوەیێکە پلینگێک هاتووەتە دارستان و ژینی لێ تال کردووین. هەروا کە دەزانین هەمووومان براین و لە خۆشی و ناخۆشیدا بە دەم

یەکترینەوەین. ورچ بەڵێنی داوە یارمەتیمان بدات و وتیشی بێمە خزمەت تۆیش. ئەوا هاتووم یاریدەمان بدەیت.

گورگ وتی:

- قەیدیێ ناکا، منیش دوو بزنت بۆ دەهێنم. بە ڕاست بیهێنمە کوێ؟

- بیهێنە ژێر داری نزیک ماڵەکەم، دەبێ ئاگادار بیت چون پڵینگ خوێن بەرچاوی گرتووە. تەنیا لە دوورەوە بڕوانە، بزانە چ دەعباییێکە.

گورگ هات و لە نزیکی ماڵی ڕێوییەوە لە پشتی گەلاکانەوە خۆی حەشاردا. ورچیش چووە سەر دارێک و چاوەڕێ بوون تا پلینگەکە بێتە دەرەوە و گۆشتەکان بخوات.

پشیلەکە لە گۆشتەکان نێزیک بووەوە، کە چاوی کەوتە گوێچکەکانی گورگ پێیوابوو سەگە خۆی شاردووەتەوە قیژاندی و چووە سەر دارەکە. ورچیش کە پێی وابوو پشیلەکە هەر ئەو پلینگەیە خۆی خستە خوارەوە و کەوتە مل زک گورگا. گورگیش کە وایدەزانی پلینگەکە کەوتۆتە ملیا بە لوورەلوور دوورکەوتەوە.

پشیلە و ڕێوی دەستیان کردە خواردنی گۆشتەکان و خۆیان تێر کرد.

پووشپەڕ ٢٧١٣

**سەرچاوە:**

**١- فرهنگ افسانەهای مردم ایران، جلد ۶، صص ٢٤٠-٢٣٧.**

# ڕێوی فەرەنجیدوور[1]

**کۆکردنەوە: محەمەدڕەزا ئاڵ ئیبراهیم**

کابرایێک هەبوو هەموو ڕۆژێ دەچوو بۆ کار و فەرەنجییێکی لە بەر دەکرد بۆ ئەوەی سەرمای نەبێ. ڕێوییێک بوو کە هەر جارەو ئەو کابرایەی دەبینی دیانی بۆ فەرەنجییەکە تیژ کردبوو و دەیویست لێی بدزێ. ڕۆژێک سەر لە بەیانی لە سەر ڕێگەیدا خۆی دا لە مردن. کە کابرا چاوی پێ کەوت لە کەرەکەی هاتە خوارێ و بۆ ئەوەی دەرنەچێ بەستیەوە. ئینجا ڕێوییەکەی خستە پشت کەرەکە. کە ویستی بکەوێتە ڕێ ڕێوی فەرەنجییەکەی لێ دزی و بۆی دەرچوو.

ڕۆیشت هەتا تووشی گورگێک هات. گورگ لێی پرسی:

- ئەم فەرەنجییەت لە کوێ هێناوە؟

---

١- فولکلۆری ناوچەی ئیستیهبان (شارێکە لە پارێزگای فارس).

ڕێوی:

- خوالێخۆشبوو باوکم فەرەنجیدوور بوو، منیش لێی فێر بووم و ئەمەم بۆ زستان دروست کردووە.

گورگ:

- بۆ منیش دروست دەکەی؟

ڕێوی:

- بە مەرجێک...

گورگ:

- چ مەرجێک؟!

ڕێوی:

- گەر بتوانی پێنج پەزم بۆ بێنی بۆتی دروست ئەکەم.

گورگ ڕۆیشت و بە هەر نقەجەڕەیێک بوو پێنج پەزی دەست خست و بۆ ڕێوی هێنا. ڕێوی پێی وت:

- بڕۆ مانگێکیتر وەرەوە.

گورگ ڕۆیشت و ڕێوی لەو ماوەیەدا لە گۆشتی پەزەکانی دەخوارد و گوێی بۆ هیچ شتێ نەدەلەقاند. کە مانگەکە تەواو بوو گورگ هاتەوە. ڕێوی خورییەکانی بلاو کردبووە سەر زەوییەکەدا و لە سەری خەوتبوو.

گورگ:

- فەرەنجییەکە ئامادەیە؟

ڕێوی:

- فەرەنجییەکەم تەواو کردووە، تەنیا قۆڵەکانی ماوە و دەبێ سێ پەزیتر

بێنی.

گورگ ڕۆیشت سێ پەزی‌تری هێنا. ئینجا پێی وت:

- برۆ حەوتەییێکی‌تر بێرەوە.

ڕێوی پەزەکانی خوارد، خورییەکانی کۆکردەوە و دەستی کردە فینگەفینگ کە گورگی لێی ئاسەلابوو. لێی پرسی:

- ئەوە بۆ دەگریت؟

ڕێوی وتی:

- فەرەنجییێکی جوانم بۆ دروست کردی، بەلام کەرسوارێک هەیە هەموو ڕۆژێ بە ئێرەدا تێدەپەڕێ لە چنگی دەرهێنام و بۆی دەرچوو. دەبێ کارێک بکەیت.

گورگ وتی:

- چ بکەم؟

ڕێوی وتی:

- دەبێ لە سەر ڕێگەی ئەو کابرایەدا خۆت بدەی لە مردن، هەر لە کەرەکەی دابەزی فەرەنجییەکەی برفێنە و هەلێ.

گورگی کلۆڵ کە فریوی ڕێوی خواردبوو چووە سەر ڕێگەی کابرا و خۆی کردە تۆپیو. کابرا کە فریوی ڕێوی خواردبوو لە کەرەکەی دابەزی، تیر و پری کوتا و مانگێک خستیە نێو جێگا. دوای مانگێک کە گیانێکی پێداهاتەوە لە نێو دارستاندا ڕێوی بینی. ڕێوی شوال کەوتە دەرقاچی و خۆی کردە کونێکدا. گورگ دەستی کوتا، کلکی گرت و کێشای. کلکی لە بنەوە قرتیا. لە بەر خۆیەوە وتی:

- لەمەولا بەرچاویم، دەبێ کارێک بکەم گورگ نەمناسێتەوە.

چووە لای هاوڕێیەکانی و پێی وتن:

- لەم نێزیکانەدا باخە هەنگوورێک هەیە. وەرن با ئەمشەو بڕۆین.

کە ڕێوییەکان هاتن، پێیانی وت:

- وەرن کلکتان بخەنە نێو ئاوی حەوزەکەوە تا بزانم باخەوان هەیە یان نا؟

هەوا زۆر سارد بوو و ئاوەکە بەستی. سەرلەبەیانی ڕێوی هات و وتی:

- زوو هەڵێن کە باخەوانەکە هات.

کە ڕێوییەکان ویستیان دەرچن کلکیان لە بنەوە قرتیا و هەموویان بە دەردی ڕێوی چوون.

پووشپەڕ ۲۷۱۳

سەرچاوە:

**۱- فرهنگ افسانەهای مردم ایران، جلد ۶، صص ۱۶۷-۱۶۵.**

# ڕێوییە کوڵە[1]

**کۆکردنەوە: مونیرۆ ڕەوانیپوور**

ڕێوییێک مافوورێکی دۆزییەوە. لە بەر کولانەکەیدا ڕایخست و لە سەری دانیشت. شێرێک بە بەردەم کولانەکەیدا ڕادەبرد. کە چاوی کەوتە مافوورەکە لێی پرسی:

- ئەمە کێ چنیویەتی؟

- وەڵلاهی شاکاری خۆمە.

- بۆ منیش دەچنی؟

- دەبێ بڕۆی دوو بەرخ و دوو بزنم بۆ بێنی، حەوتەییێکی پێ ناچێ بۆتی دەچنم. شێر ڕۆیشت دوو بەرخ و دوو بزنی بۆ هێنا، سەری برین و داینیە ڕێوی. کە شێر دوور کەوتەوە، ڕێوی خێزان و منداڵەکانی بانگ کرد و دەستیان کردە

---

١- فولکلۆری باشووری ئێران.

خواردن.

دوای حەوتـەیێک شـێر هاتـەوە. دوای چـاک و چـۆنی کـردن هەواڵـی مافوورەکەی پرسی. ڕێوی وتی:

- ئامادەیە، وێنەیێکی خۆیشتم تیا نەخشاندووە.

ئینجا ژنەکەی و شەش منداڵەکەی لە کولانەوە هاتنە دەرێ.

ڕێوی ڕووی کردە کوڕە چووکەکەی و وتی:

- ئادەی بڕۆ مافوورەکەی خاڵۆ شێرە بێنە.

ڕۆیشت و نەهاتـەوە. دووهـەمیش چـوو و نەهاتـەوە. سـێهەمیش هـەر وا، چوارەمی، پێنجـەمی و... تـا تـەواوی منداڵـەکانی ڕۆیشـتن. نـۆرەی ژنەکـەی گەیشـت. ئـەویش چـوو و نەهاتـەوە. ڕێـوی خۆیشـی بـە دوویانـدا ڕۆیشـت و نەهاتەوە. شێر هەرچی چاوەنواڕی کێشـا هـیچ سـوودێکی نـەبوو. گـۆزەیێکی دۆزییەوە، بنەکەی کون کرد و لە بەردەم کولانەکەیەوە داینـا. لـە بەرخۆیـەوە وتی: گەر ڕێوی بیەوێ بێتە دەرێ کلکی گیر دەکات و دەقرتـێ، ئـەو کاتـە لـە هەرکوییدا ببینم دەیناسمەوە. ئینجا ملی ڕێگای گرتە بەر و ڕۆیشت. ڕێوی لـە نێو کولانەکەیەوە ملـەتاتکێی کـرد. کـە زانی ڕۆیشـتووە ویسـتی بێتـە دەرەوە، کلکی قرتیا. تێدا مابوو چ قوڕێک بە سەر بپێوێ کە بیرێکی بـە مێشـکدا هـات. چوو هەتا گەیشتە نەخلستانێک. لە ناکاو چل ڕێوی لێ ئاسەلا بوون و کـە لـەو حاڵەدا بینیان، ئەوەندە تیتاڵییان پێ کرد کردیانە عەنتەری قـەو دارەکـا. بـەلام هیچ نەیخستە خۆی و وتی:

- هەر لە سەرەتاوە وا بووم.

پێکەوە چوونە پای دار خورماکان. چوونە قـەو دارەکـە و دەسـتیان کـردە

خورما خواردن. ڕێوی وتی:

- هەڤالینە لەوانەیە با هەلکات و بکەونە خوارەوە. باشتر وایە کلکتان گرێ بدەنە دارەکەوە. قبوولیان کرد. ڕێوی کلکی هەموویانی گرێ دایە دارەکەوە و خۆی هاتە خوارەوە.

پاش ماوەیێک دەنگی هەلێنا:

- ئاگادار بن خاوەن باخەکە هات.

ڕێوییەکان کە کلکیان گرێ درابووە دارەکەوە نەیانتوانی هیچ بجوولێن «کەوتنە گوو خواردن» و داوایان کرد یارمەتییان بدات. ڕێویش کلکی هەموویانی قرتاند. ڕۆژێ کە خەریک بوو پیاسەی دەکرد لە ناکاو شێری لێ ئاسەلا بوو. یەخەی پێ گرت و وتی:

- هەتیوە خوێرییە کلاو دەنیتە سەر من؟!

- چۆن دەزانی کاری من بووە؟

- لە کلکە قرتیاوەکەتا.

ڕێوی بزەیێکی هاتێ و وتی:

- هۆزی ئێمە هەموویان وان.

ئینجا دەنگی هەلێنا و چل ڕێوی ئاسەلا بوون. شێر دەمی بووە تەلەی تەقیاگ و دوور کەوتەوە.

ڕێوی کە لە دەستی شێر ڕزگاری بوو، ویستی پیاسەیێک بکات. لە ناکاو پیاوێکی چاو پێ کەوت خەم و پەژارە دایگرتبوو. دوای چاک و چۆنی پێی وت:

- سەماوەر وەرشەو قۆریە خڕەکەت/ هەرخۆم بە قوربان دلە پڕەکەت[1]

---

١- فولکلۆر.

- بۆ ئەوەندە خەمباری؟

پیاوەکە وڵامی دایەوە:

- گرتمان من دەردی دڵی خۆمم پێت وت، تۆ چیت پێ دەکرێ؟

ڕێوی وتی:

- تۆ بیڵێ، ڕەنگە بتوانم «سەربەنێکت بۆ گرێ دەم».

پیاوەکەیش بە خەمباریەوە وتی:

- وەڵلاهی نۆکەری دێوێکی ڕەشم و زۆریش لێی ئەترسم. هەموو ساڵێ لە کاتی خەلە و خەرماندا دێت، هەمووی لە چنگم دەرئەهێنێ و دەڕوات.

ڕێوی وڵامی دایەوە:

- گوێ بگرە بزانە دەڵێم چی. هەروا کە دەزانی دێو لە ئەسپ ئەترسێ، چون هەر چاوی بکەوێتە یاڵەکەی دەمرێت. ئەمجارە کە هاتەوە هەژگەڵێک ئەبەسمە خۆمەوە و دەیکەمە تەپوتۆز. ئەگەر لێتی پرسی ئەو تەپوتۆزە چییە؟ بڵێ شۆڕەسوارانی خانن بەرەو ئێرە دێن. کە پەشۆکا پێی بڵێ بچێتە نێو تەلیسێکەوە. کە چووە نێوی بیدوورێنە.

کە دێوەکە هات ڕێوی چی وتبوو هەمووی جێبەجێ کرد. ڕێوی گاشە بەردێکی هەڵگرت و دای بە سەریدا.

لەو ڕۆژە بە دواوە کابرا بە ئاسوودەییەوە خەلە و خەرمانەکەی کۆ دەکاتەوە و دەیباتەوە ماڵێ.

پووشپەڕ ٢٧١٣

سەرچاوە:

١- فرهنگ افسانه‌های مردم ایران، جلد ۶، صص ۱۸۵/۱۸۷.

# ڕێوی و کەڵەشێر

کۆکردنەوە: فەزلولڵا موهتەدی (سوبحی)

هەبوو نەبوو. کەڵەشێرێک هەبوو چەند جارێ کەوتبووە چنگ ڕێوی، بەڵام هەر جارەو بە فێڵێک خۆی دەرباز کردبوو. ڕۆژێک لە دەرەوەی ئاوایی بە دوای خواردندا دەگەڕا کە لە دوورەوە چاوی کەوتە ڕێوی بەرەو لای دەهات. نەیتوانی خۆی بگەیەنێتەوە ئاوایی، لە ناچاریدا چووە سەر دارێک.

ڕێوی کە گەیشتە ژێر دارەکە وتی:

- ئەوە بۆ تا بینیمت کردتە سەر ئەو دارە؟

کەڵەشێرەکە وتی:

- چیم بکردایە دوو دەسماڵەم بۆت بکێشایە؟

ڕێوی وڵامی دایەوە:

- مەگەر نەتبیستووە پادشا ڕایگەیاندووە تا ئێمە دەسەڵاتمان بە دەستەوە بێ نابێت هیچ گیانلەبەرێک، گیانلەبەرێکی‌تر بچەوسێنێتەوە و لەمە بە دواوە دەبێ گورگ و مەڕ لە سەرچاوکەیێک ئاو بخۆنەوە. تۆیش وەرە خوارێ پێکەوە

پیاسەیێک بکەین.

کەڵەشێر وتی:

- پیاسە کردن بە کۆمەڵ بێت خۆشترە نەک بە دوو کەس. ڕاوەستە با ئەو دوو، سێ جانەوەرە بەرەو لامان بێن ئینجا دەڕۆین.

- شێوەیان چۆنە؟

- جەستەیان وەکوو گورگە، بەڵام گوێچکە و کلکیان لە گورگ درێژترە.

ڕێوی وتی:

- نەکا مەبەستت سەگگەلی ئاواییە.

- ڕەنگە.

ڕێوی تا ناوی سەگی ژنەفت بۆی دەرچوو.

کەڵەشێر وتی:

- ئەوە بۆچی دەڕۆی؟

ڕێوی وڵامی دایەوە:

- بۆ ئەوەی هیچ نێوانمان خۆش نییە.

کەڵەشێر وتی:

- مەگەر نەتوت پادشا وتوویە نابێ کەس زوڵم لەوی‌تر بکات؟

ڕێوی وتی:

- ئەم جڕ و جانەوەرانە لە شاردا نەبوون دەترسم قسەی پادشایان نەبیستبێ و هەڵمبدڕن.

ئەمەی وت و وەک با دەرچوو.

پووشپەڕ ۲۷۱۳

# ڕێوی فێڵەباز و گورگی سەپۆل[1]

**کۆکردنەوە: عەلی‌ئەشرەف دەرویشیان**

ڕێوی و گـورگ و شـێرێک لـە دارسـتانێکی بـژوێن و دڵـبزوێندا دەژیـان. ڕۆژێک کەڵێکی قەڵەو و چاوجوان هاتە سەر چاوکەیێک ئاو بخواتەوە. مرخیـان لێ خۆش کرد ڕاوی بکەن.

ڕێوی وتی:

- من بچم؟

شێر وتی:

- ناتوانی.

گورگ وتی:

- من دەڕۆم.

١- فولکلۆری ناوچەی کرماشان (بیستوون)، بەڵام بە زمانی فارسی بلاو بووەتەوە.

شێر وتی:

- له توانای تۆشدا نییه، خۆم دەڕۆم.

ڕێوی و گورگ وتیان:

-قسە، قسەی گەورەمانە.

شێر کەلەکەی ڕاو کرد و ئاوی دا بێخیا.

گورگ کە قۆڕەی سکی دەهات بیرێکی کردەوە، ئینجا بە کلکەسووتە و زمانچەورییەوە لە شێر نزیک بووەوە. لە پڕێکدا قەپی کردە ناقیا و نقەی چنی، ئینجا دەستی کرد بە خواردن.

ڕێوی هات و گوتی:

- براله، بەشم نادەی؟

گورگ گوتی:

- نەخێر.

ڕێوی گوتی:

- هەتیو هەواڵێکی خۆشم پێیە. لەم نزیکانەدا ڕاوێکی چاکم ناوەتە ژێر سەر، وەرە با بڕۆین.

گورگ گوتی:

- باشە.

ڕێوی سەوەتەیێکی هێنا و گوتی:

- بچۆرە نێو ئەم سەوەتە. بەرەو ئەو ماڵە تلێرت دەکەمەوە. کە گەیشتی ڕاوێکی چاکی لێیە، هۆشت بێ دەرنەچێ.

گورگ گوتی:

- باشە برالە، بەڵام جۆرێ تلێرم بکەرەوە نەپڕووکێم.

ڕێوی گوتی:

- بە چاوان.

ئینجا سەوەتەکەی شەتەک دا و تلێری کردەوە.

گورگ کە تلێر دەبووەوە قیڕاندی:

- ئەوە چیت کرد؟

ڕێوی گوتی:

-هیچ نییە.

سەوەتەکە کەوتە نێو دۆڵێکەوە. لە ناکاو دوو کەس گەیشتن و ئەوەندەیان لێی دا بای باڵیان بڕی. ڕێویش لە سەری کێوەکەوە پێدەکەنی.

گورگ بە هەر گیان کەنشتێ بوو هەڵات و دوای چەند ڕۆژێ کە ڕێوی بینییەوە لێی پرسی:

- دەرباوانت بگیرگێتە هەرگ، بۆ وات لێکردم؟

ڕێوی گوتی:

- کۆڵەشەڕ، ئەو شوێنەی کە چووی ماڵی ڕێوی بوو و دەیانویست ڕاوی بکەن. تاوانم چییە؟

ئینجا ڕێوی گوتی:

- وەرە پێکەوە بژین.

گورگ گوتی:

- چی بکەین؟

ڕێوی گوتی:

- ببینه دۆست و هاورێ. من سێ بێچووم هەیە، ئەی تۆ؟

گورگ گوتی:

- منیش چوار بێچووم هەیە.

ڕێوی گوتی:

- رەحمەت لەو شیرەت. وەرە پێکەوە بێچووەکانمان گەورە بکەین.

ڕۆژی دوایی گورگ گوتی بە ڕێوی:

- کاکە تۆ ئاگات لە بێچووەکان بێ، لەو خوارەوە ڕانەمەڕێک هەیـە. دەڕۆم بەڵکوو شتێکم دەس کەوێ.

هەر کـە گـورگ دوور کەوتـەوە، ڕێـوی دوو بێچـووە گـورگی خـوارد. کـە گەڕایەوە دەستی کردە فینگەفینگ و خۆی دە قوڕ گرت.

گورگ گوتی:

- چی قەوماوە؟

- دوان لە بێچووەکانمان مردن.

- هی کاممان؟

- ئەم قسانەت ئازارم دەدا. حاشا ئیتر برای من نیـت. خێـر خـۆت و ڕۆژی خۆت.

- ئێستە چی بووە؟ بۆ دەڕۆی؟

-تۆ کە جیاوازی دەخەیتە نێوان بێچووەکانمان، شیاوی برایی نیت.

- قەیدێ ناکا، فیدای سەرت.

مـــاوەیێکی‌تری پـــێچوو. ڕۆژێـــک گـــورگ چـــوو بـــۆ ڕاو و ڕێـــوی دوو بێچووەکەی‌تریشی خوارد. کە گورگ گەڕایەوە، بە گریانەوە وتی:

- دوو بێچووی‌ترمان مردن.
- بێچووەکانی من یان تۆ؟
- ئیتر برای تۆ نیم. بێچووی من و تۆ جیاوازییان چیە؟ کەوایە هەر کەس بێچووەکانی خۆی ببات.
- دەزانی دەڵێی چی؟ هەر چوار بێچووەکەمت خواردووە.
- تاوانباریشم دەکەی؟

ئینجا دەستی کردە گریان. لە پاش ماوەیێک گوتی:

- کاکە، خەم مەخۆ. لە سەرەتاوە دیار بوو بێچووە زەردەڵەکانت دەمرن. گوێ بگرە بزانە دەڵێم چی. کەنوو هەنگوینێک هەیە، پێکەوە بچین بیهێنین و بیخۆین. نەکوا ڕۆژێک بە بێچووەکانمانەوە بدەن و بیانکوژن.

گورگ گوتی:

- لە کوێیە؟

ڕێوی گوتی:

- لە ناو قەدی ئەو کێوەدایە.

ڕێوی گوریسێکی بەستە ناو قەدی و شۆڕی کردەوە.

کە گورگ گەیشتە کەنووەکە ڕێوی لە دواوە دەستی کردە خواردنی.

گورگ قیڕاندی:

- بۆ لە پشتەوە دەخۆی؟ وەرە لە سنگمەوە دەست پێ بکە کە هەمووی گۆشت و چەورییە.

ڕێوی کە دەیزانی چ خەونێکی بۆی بینیوە گوتی:

- سپاس، هەر ئێرە باشترە. خەم مەخۆ دەگەمە ئەوێش.

# ڕێوی و چالەکە[1]

**کۆکردنەوە: مەنسوور یاقووتی**

هەبوو، نەبوو. بێجگە خـودا کەسـێ نـەبوو. ڕێـوی و چالەکـەیێک پێکـەوە دەژیـان. هـەموو ڕۆژێ بـەیانی زوو لـە خـەو هەڵدەسـتان و ئـەچوون بـۆ ڕاو. هەرچییان دەس کەوتایە پێکـەوە بەشـیان دەکـرد و هەنـدێکیان بـۆ پاشـەڕۆژ هەڵدەگرت. ڕۆژێکی پاییزی کە پێکەوە دەگـەڕان لـە ناکـاو تووشـی گورگێـک هاتن. گورگ بە تووڕەییەوە بەرەو لایان دەهات.

ڕێوی کە دەیزانی دەرچوونیان بۆ نییە، بیرێکی کردەوە و بـە هاوڕێیەکـەی وت:

- وەرە شـەڕ بکەین. ئەگەر پرسی بۆ وا دەکـەن، بێـژین شـەش منداڵـمان هەیە و دەمانەوێ لە یەک جیا بینەوە. بێژە ئەو سیانەیان کە زۆر جـوان دەبـێ

---

١- فولکلۆری ناوچەی کولیایی (کرماشان)، بەڵام بە زمانی فارسی بڵاو بووەتەوە.

من بیانبەم، منیش دەڵێم نەخێر مافی خۆمە.

گورگ هاتە لایان و بینی کە مشتومڕیانە. چوو بە گژیاندا و وتی:

- بۆچی هاتوونەتە نێو مولکی من و شەڕ دەکەن؟ هەر ئێستا هەردووکتان دەخۆم.

ڕێوی کڕنۆشی برد و وتی:

- گەورەم! دەمانویست بینە لای جەنابت تا لە نێوانماندا داوەری بکەیت.

ئینجا بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

گورگ لە بەر خۆیەوە وتی:

- جارێ نایانخۆم، کە کولانەکەیانم دۆزییەوە خۆیان و بێچووەکانیان دەخۆم. ئاخر گۆشتی بێچوو زۆر تەرچک و خۆشە.

گورگ وتی:

- هەرچەند زۆر سەرقالم، بەلام لە بەر ئەوەی نامەوێ لەم ناوچەیەدا گیروگرفتێک لە نێوان ئاژەڵەکاندا پەیدا ببێ لەگەڵتان دێم.

کەوتنە ڕێ. ڕێوی بە دزییەوە بە چاڵەکەی وت:

- کە چوویتە نێو کولانەکەوە نەیتە دەرەوە.

کولانەکەیان زۆر بچووک بوو و تەنیا ڕێوی و چاڵەکە دەیانتوانی پێدا بێن و برۆن.

ڕێوی وتی:

- ئەگەر ڕێگا بدەن دەڕۆم منداڵەکان دینمە دەرەوە.

چاڵەکە قیژاندی:

- نەخێر، نابێ ڕێوی بچێت.

گورگ وتی:

- باشه، تۆ بڕۆ و زوو بێرەوە.

گورگ و ڕێوی ماوەیێکی زۆر چاوەڕێی بوون، بەڵام چالەکەکە نەهاتە دەرەوە.

گورگ کە قۆڕەی سکی دەهات، وتی:

- بڕۆ بزانە ئەم قوڕمساخە بۆ نایتە دەرەوە؟

ڕێوی وتی:

- خۆتان بینیتان، ئێستا حەقم پێ ئەدەن؟

چووە نێو کولانەکەوە، سەری هێنا دەرێ و گوتی:

- مامە گیان! ئاشتمان بووەوە، دەتوانی بچی.

خەرمانان ٢٧١٢

سەرچاوە:

١- فرهنگ افسانەهای مردم ایران، جلد ۶، صص ۲۵۹-۲۵۷.

# گورگ و ڕێوی[1]

**کۆکردنەوە: سەمەد بێهرەنگی، بێهرووز دێهقانی**

ڕێوییێک لە ڕێگەییێکدا ڕاکشابوو و خۆی دابوو لە مـردن، لـەو سەردەمەشـدا کەوڵەکەی زۆر بەنرخ بوو. کۆمەڵـێک هـەبوون بووکیـان دەگواسـتەوە، هەرکـە ڕێوییان بینی هەڵیانگرت و خستیانە جواڵـەی ئەسـپی بووکەکـەوە. لـە پڕێکـدا بووک شتێکی لێوە دەرچوو. ڕێوی گوێی لێ بوو و وتی:

- بووکەخان دەتەوێ ناوت بزڕێنم؟

بووک پەشۆکا و وتی:

- لە دەورت گەڕێم ڕێوی نەکەی بیڵێی. ملوانکەکەمت ئەدەمێ.

ڕێوی ملوانکەکەی وەرگرت و گوتی:

- من خۆمم بۆ ڕاناگیرێ، دەیڵێم.

---

١- فولکلۆری ناوچەی ئازەربایجانی ئێران.

بووکەکە پاڕایەوە و گوتی:

- خرخاڵەکانیشم بۆ تۆ، ئیتر هیچ مەڵێ.

ڕێوی خرخاڵەکانیشی وەرگرت و ئەوەندە سەری خستەسەری کە هیچی بۆ نەمایەوە. ئینجا لە سەر ئەسپەکە دابەزی و بە دەم هەڵاتنەوە دەیوت:

- خەڵکینە بزانن کە بووک ئیشێکی خراپی لێ هەستاوەتەوە.

پاش ماوەیێک تووشی گورگێک هات. گورگ ڕێوی بینی کە سەر تا پای ئەدرەوشێتەوە. لێی پرسی:

- هاوڕێیەکەم ئەمانە چین؟

ڕێوی گوتی:

- مشتێ مت و مووروو. ئیتر وازم لە گەڕالی هێناوە و وردەواڵە دەفرۆشم.

گورگ گوتی:

- نانت کەوتۆتە ڕۆنەوە. دە پێم بڵێ دەسمایەکەت لە کوێ هێناوە؟

ڕێوی گوتی:

- لە نێو ئەو چۆمەوە. ئێوارە بڕۆ کلکت بخەرە نێو ئاوەکە و چاوەڕێ بە. بەیانی کە کلکت دەرئەهێنی ئەوەندە زێڕ و زیوی پێوە دەنووسێ نەتوانی بجووڵێی. ئەو کات دەتوانی وەک من کاسبی بکەیت و واز لە گەڕالی بێنی.

گورگ باوەڕی کرد و لە بەر خۆیەوە گوتی:

- چەندە کەمتەرخەم بووم.

ئێوارە چوو کلکی خستە نێو ئاوەکە و چاوەڕێ بوو.

زستان بوو و تفت هەڵختبا لە ئاسمانا ئەیبەست. ئاوی چۆمەکە بەستی و گورگ گیری کرد. سەرلەبەیانی کلکی جووڵاندەوە، بینی کە زۆر قورس بووە. لە

بەر خۆیەوە گوتی:

- باشتر وایە پەلە نەکەم تا خشڵی زۆرتر بە کلکمەوە بنووسێ.

عەرەبانەچییەکان کە دەچوون بۆ ئیش و کار، گورگیان بینی لە لێواری چۆمەکەوە دانیشتووە و هیچ ناجووڵێت. وەیانزانی خۆی بۆ بزنەکان مەڵاس داوە، هەر بۆیە شالاویان برد بۆی. گورگ لە ناکاو هەڵات و کلکی لە بنەوە قرتیا. لە کاتێکدا هەڵدەهات و لە جێی کلکیەوە خوێن دەچۆڕا گوتی:

- ڕێوی فێڵەباز دەزانم چ بەڵاییێکت بە سەر دێنم.

کە ڕێوی بینی گوتی:

- وەرە با بتخۆم. وتت کلکم بخەمە نێو سەهۆڵ تا لە بنەوە بقرتێ.

ڕێوی مریشکێکی گرتبووە دەمەوە و گوێی لە قسەکانی دەگرت. کە قسەکانی تەواو بوو گوتی:

- ژاوەژاو مەکە. خۆت کاڵفامی سووچی من چییە؟ زووتر کلکت دەربهێنایە کە نەقرتایە. منیش وازم لە وردەواڵەفرۆشی هێناوە و قەساوی دەکەم. ئەگەر بتەوێ فێرت دەکەم چی بکەیت و بتوانی پارەییێکی زۆر کۆ بکەیتەوە.

گورگ گوتی:

- دەسمایەم لە کوێ بوو؟

ڕێوی گوتی:

- فلان خانوو مریشک و کەڵەشێرێکی زۆری لێیە. بڕۆ چەند دانەیان بگرە.

گورگ شەو خۆی کردە کولانەی مریشک و کەڵەشێرەکاندا. خاوەن ماڵ لە دەنگی مریشکەکان ڕاچڵەکی. چێوێکی هەڵگرت؛ تێروپڕی لێدا و ڕاوی نا.

گورگ کە ئەوەندەیان لێ دا بوو نەیدەتوانی بجوولێتەوە، لـە بـەر خۆیـەوە وتی:

- ئای فێڵەباز، ئەمجارە ناتوانی لە دەستم دەرچی و پاسای بکـەی. باوکـت دێنمە پێش چاوت.

ڕێوی بینی کە گورگ خوێن بەرچاوی گرتووە، چووە نێو ئاشێکەوە و سـەر و ڕووی خۆی نایە ئارد و لە سەر جۆگەلە ئاوێک دانیشت.

گورگ لە ئاشەکە نزیک بووەوە و قیڕاندی:

- سەگباب، ئەمجارە ئیتر دەتخۆم و حەسرەتی ئـەم دنیایـە دەنێمـە سـەر دڵت.

ڕێوی گوتی:

- ئەم قسە قۆڕانە کێ فێری کردووی؟ لە سمنجی خۆتـە هـەر چیـت فێـر دەکەم ناتوانی پاروە نانێکی لێ دەسـت بخـەیت. ئینجـا بـە چ ڕوویێکـەوە بـە سەرمدا ئەبۆڵێنی؟ ئەگەر دەتەوێ ئەم ئاشەم بەکرێ گرتووە. وەرە پێکەوە ببینە شەریک.

گورگ گوتی:

- چەشکەی هیچێکم نەکردووە. بەردلێک بخەم ئینجا ڕێک دەکەوین.

ڕێوی گوتی:

- بچۆرە ژوورەوە. بەرداشەکان ئاردیان پێوەیە، بیلێسەرەوە.

هەر کە دەمی گەیشتە بەرداشـەکان، ڕێـوی ئاوەکـەی هەڵـکرد و ئاشـەکە کەوتە کار. گورگ دەم و چاوی بریندار بوو.

ڕێوی بۆی دەرچـوو و بـرێ شوولـی کـۆ کـردەوە. ئینجـا دەسـتی کـردە

سەوەتەچنین.

گورگ کە دەم و چاوی خوێناوڵ ببوو، هات و گوتی:

- قوڕمساخ، ئەمجارە ناتوانی تەفرەم بدەی. وەرە دەمەوێ بتخۆم.

ڕێوی سەرێکی لەقاند و گوتی:

- ئەمەیە دەڵێن «خاسیکەرە، خۆڵ بە سەرە» گەوجی بەسە. وەرە با فێرت بکەم چۆن سەوەتە بچنی.

گورگ چووە پێشەوە و گوتی:

- چلۆن فێر ببم؟

ڕێوی گوتی:

- بچۆرە نێو سەوەتەکەوە، سەیر بکە با فێر ببیت.

گورگ لە نێو سەوەتەکەدا هەڵتووتا و ڕێویش دەستی کرد بە چنین.

گورگ گوتی:

- برا خۆ من هیچ فێر نابم.

ڕێوی گوتی:

- لە جیاتی قسە کردن سەیر کە با فێر ببیت.

گورگ تا هات فێری سەوەتەچنین ببێت، ڕێوی سەوەتەکەی شەتەک دا. شوانێک لەو پێدەشتەوە ڕادەبرد. ڕێوی گوتی:

- خالۆ، کەنووە هەنگوینێکم هەیە، دەتەوێ؟ ئینجا سەوەتەکەی تلێر کردەوە.

شوانە هەڵیگرت و بردیەوە ماڵێ. بە دایکی گوت:

- کەنووە هەنگوینێکم هێناوەتەوە، نەکەی بە براکانم بڵێی. دەمەوێ

بەیانیان لێی بخۆم تا گیانێکم پێدا بێتەوە.

بەیانی دایکی هەستا، دەستێکی کردە کونی سەوەتەکەدا و نایە دەمی. بینی کە زۆر تامسارە. چوو باسەکەی بۆ کوڕەکەی گێڕایەوە. کوڕەکەی گوتی:

- لاچۆ بزانم. دەڵێی تا ئێستا چەند جار خواردووتە.

چوو دەستێکی کردە کونی سەوەتەکەدا. تومەز لەو کاتەدا گورگ باوێشک ئەدات و دەستی ئەچێتە قوڕگیا. لە پڕێکدا شوانە هاواری لێ هەستا و چوو تێلاییێکی هێنا. سەوەتەکەی شکاند و گورگ هاتە دەرەوە. ئەوەندەیان لێ دا ئاخ و ئۆخیان لێ بڕی. گورگ بە هەر گیانکەنشتێ بوو لە دەستی شوان و براکانی هەڵات و بە لەتردان دوور کەوتەوە. لە بەر خۆیەوە گوتی:

- گەر بیبینم دەزانم چی بە سەردا دێنم.

سەیری کرد لە سەر دیوارێک دانیشتووە، گوتی:

- وەرە خوارێ بەلەعنەت بی.

ڕێوی گوتی:

- هەر ئێستا لە بیر خواردنێکی خۆشدا بووم بۆت. سەیر کە چ باخێکم کڕیوە.

گورگ گوتی:

- بێژە باخەوانەکەت دەرکەم بۆ بکاتەوە.

ڕێوی گوتی:

- باخەوانەکەم لە ژوورەوە خەریکی ترێ چنینەوەیە، خۆت بپەڕە و بێرە نێو باخەکەوە.

گورگ لە دیوارەکە سەرکەوت و چووە نێو باخەکەوە.

ڕێوی پێی گوت:

- فەرموو لەو چەورییە بخۆ، دوایی گلەیی نەکەی.

گورگ وتی:

- خۆت بۆ ناخوێ؟

ڕێوی وتی:

- بە ڕۆژووم.

گورگ هەر دەمی گەیشتە چەورییەکە، بووە تەڵەوە و چەوریش کەوتە بەردەم ڕێوی. ڕێویش بیسمیلایکی وت و خواردی. گورگ وتی:

- مەگەر نەتوت بەڕۆژووم؟

ڕێوی وتی:

- با، بەلام مانگم بینی ڕۆژووەکەم کردەوە.

گورگ وتی:

- کەنگێ جێژنی ڕەمەزانە؟

ڕێوی وتی:

- ئەو کاتەیە خاوەن باخەکە بێت.

لەولاشەوە باخەوانەکە کوڕەکەی ناردبوو سەیری تەڵەکە بکات. کوڕەکە گورگی بینی باوکی بانگ کرد و هەردووکیان ئەوەندەیان لێ دا بای باڵیان بڕی.

گورگ بە ڕێوی وت:

- مەگەر نەتوت ئەم باخەم کڕیوە، قەباڵەکەیان پیشان بدە با وازم لێ بێنن.

ڕێوی گوتی:

-پێشینیان وتوویانه «ڕێوی تا قەباڵەی خۆی خوێند، پێستیان کەند». کـه باخەوان وکوڕەکەی چوون ڕێوی لێی نزیک بووەوە.

گورگ وتی:

- خەریکم دەمرم، ڕزگارم کە.

ڕێوی وتی:

- هیچم لە دەست نایە. ئەگەر دەتەوێ ڕزگاریت بێ خۆت بکە تۆپیو.

گورگ خۆی کردە تۆپیو. کە باخەوان تەڵەکەی کردەوە، گـورگ هـەڵات و بە ڕێوی وت:

- نادروست کە ئەمجارە بتگرم ئەتخۆم.

پیرەشێرێک لە دارستاندا دەژیا. ڕێوی کـە دەیـزانی دەرچـوونی بـۆ نییـە، وتی:

- باشتر وایە بڕۆم لـە خزمـەتی شـێردا بم. گـورگ لێـی ئەترسـێ و پێـی ناوێرێ.

چووە لای شێر و وتی:

- گەورەم ئەگەر ڕێگا بدەن دەمەوێ لە خزمەتتدا بم. جەنابتان لە ماڵـەوە دائەنیشن و منیش خواردنت بۆ ئامادە دەکەم.

شێر وتی:

- باشە.

گورگ قوشقی ببوو. دەیویست بیگرێت و هەڵیدڕێنێ. بۆی دەرکـەوت لـە خزمەتی شێردایە. ئەویش چووە لای شێر و وتی:

- گەورەم ئەگەر ڕێگا بدەی دەمەوێ لە خزمەتی تۆدا بم.

شێر ئەویشی قبووڵ کرد.

یەکە یەکە دەچوون و خواردنی شێریان دابین ئەکرد. ڕۆژێک شێر سەرئێشەی گرت. گورگ لای شێر مابووەوە و ڕێویش چووبووە دەرێ. کە گەڕایەوە گورگ چوو بە گژیدا و وتی:

- بەوتەشک، مەگەر نازانی ئاغا نەخۆشە؟! کەچی تۆ دەچی بۆ خوێڕی بازی؟

ڕێوی گوتی:

- چووبوومە لای حەکیم.

گورگ گوتی:

- دەباشە، چی گوت؟

وڵامی دایەوە:

-تەنیا بە ئاغای دەڵێم.

شێر لاییکی لێ کردەوە و گورگ چووە دەرێ.

ڕێوی چرپاندیە گوێیدا و گوتی:

- حەکیم دەڵێ دەوای ئەم سەرێشەتە گۆشتی سینگی گورگە.

شێر گوتی:

-شتێکی دەگمەنیشی نەوتووە. لای خۆمان دەست ئەکەوێ.

ڕێوی چوو بە گورگی گوت:

- بڕۆ ئاغا بانگت ئەکا.

هەر کە گورگ لە شێر نزیک بووەوە قەپی بۆ سینگی داوەشاند و پارچەییکی لێ کردەوە. گورگ بە لوورەلوور ڕایکرد.

لە کاتێکدا هەموو لەشی خوێناوڵ ببوو، ڕێوی دوای کەوت و لێی پرسی:

- بۆ کوێ دەرئەچی هاوڕێیە سوور پۆشەکەم؟

گورگ گوتی:

- بچۆ فێڵەباز، دۆعای خێر بکە کاتێک کەوتوویتە دەستم کە هیچم لێ نایە.

ئەمەی وت و تۆپی.

خەزەڵوەر ٢٧١٢

**سەرچاوە:**

**- افسانەهای آذربایجان، صص ٢٢٠-٢١٢.**

# گورگ و ڕێوی[1]

**وێژەر: عەلی ئاسمەند، حسێن خوسرەوی**

باخەوانێکی پیر باخە هەنگووریکی بوو، ڕێوییێکیش فێری بوو دەهات و لێی دەخوارد. باخەوان پێی زانی و تەڵەی بۆ نایەوە، پلێ چەوریشی بۆ دانا.

شەو کە ڕێوی هات و تەڵەکەی بینی، دوو قەرانییەکەی داکەوت و پێچیەو کرد. لە نێو دارستاندا پیاسەی دەکرد کە گورگێکی بینی. بە زمانچەورییەوە لێی نزیک بووەوە و وتی:

- ماڵت بە قوڕێ نەگیرێ لە کوێی سەعاتێکە لێت دەگەڕێم.

گورگ وڵامی دایەوە:

- چ کارێکت پێمە؟

ڕێوی گوتی:

---

١- فولکلۆری ناوچەی چوارمەحاڵ و بەختیاری.

- دوێشەو زەماوەندی براکەم بوو و جێگەت سەوز بوو؛ بەڵام پلێ چەوریم بۆ هەڵگرتووی.

گورگیش کە قوڕەی سکی دەهات و ئاو زاییبووە دەمی، گوتی:

- کوا؟ لە کوێیە؟

کەوتنە ڕێ و ڕێوی باخێکی پیشان دا و گوتی:

- فەرموو چەورییەکە لە نێو باخەکەدایە.

گورگ هەر چاوی کەوتە چەوری ئیمانی هەردە بوو و شالاوی بۆی برد. هەر دەمی گەیشتە چەوری بووە تەڵەوە و چەوریش کەوتە بەردەم ڕێوی. ڕێویش چەورییەکەی هەڵگرت، چووە سەر دیواری باخەکە و خواردی. ئینجا دەنگی هەڵێنا و گوتی:

- هۆ باخەوان ئەوە لە کوێی؟

باخەوان کە دەنگی ڕێوی بیست، پێی وابوو بووەتە تەڵەکەوە، بێلاسنێکی هەڵگرت و هات. ڕێوی لە دیوارەکە هاتە خوار و خۆی دزییەوە. باخەوانیش بەربووە گیانی گورگ و ئازای ئەنامی ڕەش و کەوگەو کرد.

گورگ کە هەموو گیانی خوێناوڵ ببوو، بە هەر گیان‌کەنشتێ بوو لە دەست باخەوان هەڵات و بۆی دەرچوو.

پاش چەند ڕۆژێ کە گیانێکی پێدا هاتەوە، بڕیاری دا ڕێوی بگرێت و کەولی بکات. ڕۆژێک کە لە نێچیر دەگەڕا لە دوورەوە ڕێوی بینی. ڕێویش لێو لە بان دەمیەوە ڕەق بوو و خۆی گەیاندە بیرێک. لە سەر بیرەکە دوو دۆڵچە هەڵواسرا بوو کە کاتێ یەکیان دەچووە خوار ئەوی‌تریان دەهاتە سەر. ڕێوی چووە نێو دۆڵچەیێک و چووە خوارەوە. کە گەیشتە بن بیرەکە بەردێکی سپی

هەڵگرت و چاوەنواڕی گورگ بوو. کە گورگ گەیشتە سەر بیرەکە وتی:

- هەتیوە خوێڕییە! دڵنیا بە ئەم دڕکە لە ژێر پات دەرتێرم.

ڕێوی بە ترسەوە گوتی:

- ئامۆزا گیان! بڕوا بکە بێتاوانم، هەمووی خەتای باخەوانە، ئەوەش چەورییە کە لەگرە دامنابوو با دەستی کەسی پێ ڕانەگات.

گورگ کە چاوی کەوتە بەردەکە گوتی:

- زوو بیهێنە کە لە دوێنێوە تا ئێستا هیچم نەخواردووە.

ڕێوی جوابی دایەوە:

- کاکەلێ ئێوە وەرنە خوارێ. لێرە هەم فێنکە، هەم ئاویش هەیە.

گورگ هەر چووە نێو دۆلچەکە تا بێتە خوارەوە، ڕێوی کە لە نێو ئەو دۆلچەکەیتردا دانیشتبوو چووە سەر. هەر گەیشتە لێواری بیرەکە بۆی دەرچوو.

پاش ماوەیێک شوانەکان هاتن بزنەکانیان ئاو بدەن. کە دۆلچەکەیان دەکێشا بینیان زۆر قورسە. کە گورگیان بینی ئەوەندەیان لێی دا ئاخ و ئۆخیان لێ بڕی و دوایی‌کە پێیان وا بوو تۆپیوە خستیانە نێو دۆلێکەوە.

پاش چەند ڕۆژێک کە ڕێوی بینییەوە، پێی گوت:

- فێڵەباز، ئیتر ئەمجارە دەرچوونت بۆ نییە.

ڕێوی گوتی:

- براله پێم وایە هەڵەت کردووە. من لە هۆزی کلک دوگمەییم و ڕێخ لە نێو کلاشماندا نییە.

گورگ کە چاوی کەوتە دوگمەکە کوتەک خواردنی لە بیرەوە چوو و وتی:

- چەندە جوانە! بریا منیش کلکم وەها بوایە.

ڕێوی گوتی:

- ئەگەر ئەتەوێ کلکت وەکوو هی منی لێ بێ، دەبێ شەوێکی ساردی پاییزی کلکت بخەیە نێو ئاوی ئاشێکەوە. بەیانی دوگمەیێکی جوان بە کلکتەوە دەنووسێ.

گورگ ڕۆیشت و کلکی خستە نێو ئاوی ئاشێکەوە. دوای ماوەیێک ئاوەکە بەستی و گورگ گیری کرد.

بەیانی کە ئاشەوان ویستی ئاوەکە هەڵکا بینی ئاو نییە. سەیری کرد گورگ بەر ئاوەکەی گرتووە. کام لات دێشێ کوتای و کە ویستی دەرچێ کلکی قرتیا.

بۆ بەیانی کە ڕێوی بینییەوە، سەیری کرد خەریکی سەوەتە چنینە.

چووە گژیا و وتی:

- فێڵەباز، وات لێ هاتووە دەمەخەڵەتێنی؟

ڕێوی گوتی:

- ها، چییە ئەوەندە تووڕەیت؟ ئێمە خێڵی سەوەتە چنگەل خەریک کار خۆمانین. ئەو ڕێوییەی کە وای لێ کردووی ڕەنگە لە هۆزی کلک دوگمەیی بووبێت.

گورگ گوتی:

- بە خودا ڕاست ئەکەی. پێم بڵێ لە کوێ دەتوانم بیدۆزمەوە؟

ڕێوی وڵامی دایەوە:

- دەمێکە هیچیانم نەبینیوە. ڕەنگە زستانی پار هەموویان ڕەق

هەلاتبێتن.

گورگ وتی:

- ئێستە بڵێ ئەم سەوەتەتە بۆ چییە؟

ڕێوی:

- وەڵلاهی بۆ زستانە، بۆ ئەوەی تووشی بەفر و سەرما نەبم.

گورگ:

- بۆ منیش دروست ئەکەی؟

ڕێوی:

- بە سەر چاو. ماڵەکەم لە سەر ئەو تەپۆڵکەیە، سبەینێ وەرە و وەریگرە.

ڕۆژی دوایی گورگ بە خۆشحاڵییەوە چوو بۆ ماڵی ڕێوی. ڕێوی چووە پیریەوە و گوتی:

- ئەوەش سەوەتەکە، بچۆرە ناوی بزانە چۆنە.

هەر کە گورگ چووە نێو سەوەتەکە ڕێوی سەوەتەکەی شەتەک دا و تلێری کردەوە.

سەوەتەکە کەوتە نێو ڕۆخانە و ئاو بردی.

ڕەشەمە ٢٧١٢

سەرچاوە:

١- افسانەهای چهارمحال و بختیاری، صص ٣٩-٣٥.

# ڕێوی جامقولیباز[1]

**نووسینەوە: مێهدی ئازەریەزدی**

لە چۆڵەوانییێکدا گورگێک دەژیا کە هەموو ڕۆژێ لەو نێوەدا خولەی دەهات و هەر ئاژەڵێکی دەس کەوتایە دەیخوارد. ڕۆژێـک هـەرچی گـەڕا هیچـی دەس نەکەوت. قۆڕەی سکی دەهات. لە بەر خۆیەوە گوتی:

- باشتر وایە بڕۆمە نێو گوند و مریشکێ، کەڵەبابێک بقاچێنم.

بەڵام زۆر زوو پەژیوان بووەوە، چونکە لە سەگ دەترسا و نەیدەوێرا تـوخنی کەوێ.

لەم بیر و خەیاڵەدا بوو کـە لـە دوورەوە کەروێشـکێکی بیـنی کـە لـە بـن هەژگێکدا خەوی لێکەوتبوو. ئاو زاییە دەمی و لە بەر خۆیەوە وتی: گەر شانسـم هەبێت و خەبەری نەبێتەوە نانم لە نێو ڕۆندایە، بەڵام ئەگەر بێـت و لـە دەسـتم

---

١- چیرۆکێک لە «کلیلە و دمنە»

دەرچێ گرتنی ئەستەمە.

پسکەپسک چوو خۆی گەیاندە لای، تووکە شەقێکی پیا دا و وتی:

- دە هەستە. تاکەی دەخەوی؟

ئینجا بە تەوسەوە وتی:

- باوڕێ هیچ هەواڵمان ناپرسی!!

کەروێشک کە لە خەو ڕاچلەکی و گورگی بینی، تف لە دەمیا وشک بوو. زانی کە خراپ تووش بووە و دەرچوونی بۆ نیە. هیچ نەیخستە خۆی و وتی:

- گەورەم، هەمیشە هەواڵم پرسیوی. هەر چۆنێ بێت گەورەیکیان وتووە، بچووکێکیان وتووە.

گورگ لە زەوقی دا و وتی:

- وس بە بەدبەخت. خۆم زوخاڵ فرۆشم گەرەکتە من ڕەش کەی؟ ئێستە کە خراپ تووش بووی کەوتیتە خولتەکردن. لە بەیانییەوە تا ئێستا هیچم نەخواردووە دەمەوێ بتخۆم.

کەروێشک زانی کە گورگ بە هیچ کلووجێ ناخلەتێ، گوتی:

- پووکاوڵ ناوچاوم بێت ئەگەر زمانچەوریت بۆ بکەم. لە خزمەتتام و هەرچێ بێژیت بە سەر چاو دەیکەم.

گورگ وتی: دەپێم بڵێ چی دەتوانی بکەیت؟

کەروێشک وتی:

- خۆت ئەزانی لە چنگی تۆدام و دەرچوونم بۆ نییە. تۆش برسیتە و هەر کاتێ بتەوێ دەتوانی بمخۆی. وایە یان نا؟

گورگ وڵامی دایەوە:

- بەڵێ وەڵلا.

کەروێشک وتی:

- دەی باشە، دەڵێن خنکاو پەلاماری پووشیش ئەدا. لەم نێزیکانەدا ڕێوییێکی قەڵەو هەیە ئەگەر بتەوێ لە خشتەی ئەبەم و دەیخەمە تۆڕت. ئەگەریش تێرت نەخوارد منیش بخۆ.

گورگ سێ و دوو دڵەی خۆی کرد و لە بەر خۆیەوە گوتی:

- لە مشتێ پێشە و پلان زیاتر هیچی نیە. ئەگەر ڕێوی کەوتە تۆڕم هیچ، ئەگینا هەر خۆی دەخۆم.

ئینجا بە کەروێشکی گوت:

- ئەوا دەڕۆین. ئەگەر بتەوێ بمخەڵەتێنی چەرمی چاوت ڕەق دەکەم.

هەر دووکیان ملی ڕێگایان گرتە بەر، تا گەیشتنە بەرماڵی ڕێوی. کەروێشک وتی:

- مامە گیان، تۆزێ ڕاوەستە تا دێمەوە.

دەمێک بوو کەروێشک لە دەستی ڕێوی دڵی خوێن بوو و دەیەویست پەنێکی پێ بدات. چووە نێو کولانەکەی و سڵاوی لێ کرد. ڕێوی چووە پیرییەوە و وتی:

- بەهـ بەهـ پاییزە برا! کەر کوێ تۆپیوە کەوتیتە بیر ئێمە؟! یا خوا بە خێر بیت.

کەروێشک وتی:

- براڵە بە خودا زۆر تاسەتم کردبوو و دەمویست بێمە خزمەتت. تەنگ و چەڵەمەی ژیان ئەوەندە زۆرە نامپەرژێ سەری خۆم بخورێنم. ئەوا ئیمڕۆ ئەم

هەلە ڕەخسا و توانیم بێمە حزوورت. ڕاستی کۆنە دۆستێکم لە لا میوانە لە بواری شیعر و ئەدەبیاتدا کار دەکات و زۆر بە تاسەیە بتبینێ. ماڵەکەی مەکۆی نووسەران و شاعیران و ئەدیبانە. زۆری حەز لێیە تۆش لە کۆبوونەوەکانیاندا بەشداری بکەیت. ئەگەر ڕێگا بدەی بێتە خزمەتت، ئەگینا وەرە دەرەوە لەگەڵیا ئاشنا ببە.

ڕێوی کە خۆی لە زۆڵەکانی ڕۆژگار بوو، زانی کە ئەم ماستە بێ موو نیە. لە وڵامدا وتی:

- ئەوە چ قسەیێکە؟! ماڵ، ماڵی خۆتانە.

لە ناکاو وتی:

- تۆزێ ڕاوەستە تا دێمەوە. شیربرنجم لێ ناوە با سەرێکی لێ بدەم.

ڕۆیشتە هێشخان و لە پشتی پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی کرد. لەو لاشەوە کەروێشک بسکەی سوێلی دەهات، چونکە لە لایێکەوە گورگی ڕازی دەکرد و خۆی دەرباز دەکرد. لە لایێکی‌تریشەوە تۆڵەی لە ڕێوی ئەسەندەوە و لە دواییشدا ئەنیشتە پای شیربرنجەکە. لەولاوە ڕێوی کە سەیری دەرەوەی کرد، گورگی بینی. لەبەر خۆیەوە وتی: شەرت بێ کارێکتان پێ بکەم با بە دەواری شڕی نەکردبێ.

هیچ نەیخستە خۆی. گەڕایەوە لای کەروێشک و وتی:

- بمبوورە جێم هێشتی. شیربرنجەکە دەکوڵا، ئاگرەکەی ژێریم کوژاندەوە با نەسووتێ. زۆر بە تاسەم هاوڕێکەت ببینم. چ شتێ لەوە خۆشترە لەم دوو ڕۆژی عومرەدا سەردانی یەکتر بکەین!! ئەگەر ڕێگا بدەی تۆزێ ماڵەکەم خاوێن کەمەوە و گولاوپرژێنی بکەم.

کەروێشک بینی کە درۆکانی کاری خۆیان کردووە، بۆیە گوتی:

- پێویست ناکا، هاوڕێکەم زۆر خاکەڕایە، بەلام هەر جۆرێ پێت خۆشە، با قسەی تۆ بێت.

گەڕایەوە لای گورگ و قسەکانی بۆ گێڕایەوە. وتیشی:

- بێجگە ئەم ڕێوییە، چەند چەقەڵ و ڕێوی‌تریشم ناوەتە ژێر سەر.

ڕێویش کە لە شوێنێکدا نەدەخەوت ئاو لە ژێری کەوێ، ماوەیێک لەمەوپێش لە پشتی دەرگای ماڵەکەیدا چالێکی قووڵی کەندبوو. تەختەیێکی نابووە سەری و بەڕە شڕەیێکی لێ ڕاخستبوو. دەسبەجێ تەختەکەی لابرد، بڕێ شووڵی خستە سەر چاڵەکە و فەرشێکی زۆر جوانیشی ڕاخست. لەو لاشەوە لە پشتی ماڵەکەیەوە درگاییکی‌تر هەبوو تەنیا خۆی پێی دەزانی. لە سووچێکەوە خۆی داگرت و گوتی:

- دەبێ بمبوورن زۆر بە چاوەڕوانی هێشتمنەوە.

کەروێشک و گورگ بە خۆشحاڵییەوە چوونە ژوورەوە. هەر کە گەیشتنە پشتی درگاکە، کەوتنە نێو چاڵەکە. گورگ کە پێی وابوو کەروێشک تەڵەی بۆ ناوەتەوە هەڵیدڕی.

ڕێوی دەنگی هەڵێنا:

- کەروێشک! کەروێشک!

گورگ لە بنی چاڵەکەوە هاتە دەنگ و وتی:

- کەروێشکی بەدفەڕ گەیشتە سزای خۆی، گوریسێک بێنە دەرم بێنە.

ڕێوی پێکەنی و وتی:

- بەڵێ، سزای ئەو کەسەی دۆستی خۆی دەفرۆشێت و «بە دۆسی دۆسی

ئەکەنێ پۆسی» هەر ئەوەیە، بەلام تۆش لەو کەرتری کە فریوی قسەکانی دەخۆیت. ئینجا وەکوو میوان دێیتە مالەکەم و دەتەوێ وەک مار پێوەم بدەی؟! بەردێکی هەلگرت و دای بە سەریا.

گولان ۲۷۱۳

سەرچاوە:
۱- قصەهای خوب برای بچەهای خوب (۱)، صص ۳۱-۲۷.

# کەروێشکی زیتەڵە[1]

نووسینەوە:مێهدی ئازەریەزدی

لە دارستانێکی بژوێن و دڵبزوێندا گیانلەبەرێکی زۆر وەکوو کەروێشک، بەراز، ئاسک، مەیموون و کەڵەکێوی بە بێ‌خەم دەژیان، بەڵام شێرێکیان تووش ببوو زیپی لێیان تەنگ کردبوو. هەموو ڕۆژێ خۆی لێیان مەلاس دەدا و لە پڕێکدا یەکیانی دەگرت و دەیخوارد. لە بەر ئەوەی کەس دەرەقەتی نەدەهات متەقیان نەدەکرد و ژیانیان لێ تاڵ ببوو؛ کەس نەیدەزانی بەیانی کە دێنە دەرەوە گەڕانەوەیان بۆ هەیە یان نا؟

لە ناو دارستاندا کەروێشکێکی زیتەڵە هەبوو کە بۆ ڕزگار کردنی گیانی هاوڕێکانی پیلانێکی دارشت. هاوڕێکانی کە پیلانەکەیان بە باشی هەڵسەنگاند و زانیان بیرێکی زۆر باشە، قبووڵیان کرد. ڕۆژێک هەموویان کۆ بوونەوە و

---

١- چیرۆکێک لە «کلیلە و دمنە».

کەروێشکیان کردە نوێنەری خۆیان کە لەگەڵ شێردا قسە بکات. کەروێشک لێی چووە پێشەوە و وتی:

- جەنابی شێر، بە نوێنەرایەتی گیانلەبەرەکانەوە هاتوومەتە خزمەتت قسەت لەگەڵدا بکەم. هەمووان دەزانین لە ئێمە بەهێزتری و لە بەر ئەوەی ناتوانی گژوگیا بخۆی، هەموو ڕۆژێ یەکێکمان ڕاو دەکەیت و ڕۆژی واش هەیە لە بەر ئەوەی هیچت دەس ناکەوێ برسی دەمێنییەوە، هەر بۆیە بێچووەکانمان ناوێرن لە نێو دارستاندا پیاسە بکەن. ئەوا هاتووین ڕێککەوتنێکمان هەبێت بۆ ئەوەی هەردوولا بە ئاسوودەییەوە بژین.

شێر پرسی:

- چ ڕێککەوتنێک؟

کەروێشک وتی:

- بەو مەرجەی لە ناکاودا هێرش نەکەیتە سەر گیانلەبەران، هەر ڕۆژە و لە نێوان خۆماندا یەکێک هەڵدەبژێرین و بۆتی دەنێرین. بەمجۆرە هەموو کات خواردنەکەت ئامادەیە.

شێر وتی:

- زۆر باشە، دەبێ هەموو ڕۆژێ دەمەونیوەڕۆ خواردنەکەم بۆ بێنی، نەکەی دێر بیهێنی، ئەگینا چەرمی چاوتان ڕەق دەکەم.

گیانلەبەرەکان قبوولیان کرد و هەموو ڕۆژێک لە نێوان خۆیاندا یەکێکیان هەڵدەبژارد و لەگەڵ کەروێشک بۆ شێریان بەڕێ دەکرد.

ڕۆژێک نۆرەی بەرازەکان بوو، ڕۆژێک کەلەکێوی، ڕۆژێک ئاسک، ڕۆژێک مەیموون و هەتا گەیشتە نۆرەی کەروێشکەکان.

کەرویشکەکان کۆ بوونەوە و تیروپشکیان کرد. ناوی برای کەرویشکەکە دەرچوو. کەرویشکی زیتەڵە کردیە سەر بەردێکدا و وتی:

- هاوڕێیان گوێ بگرن بزانن دەڵێم چی. لە بیرتانە ماوەیێک لەمەو پێش هەمووان لە شێر دەترسان و پێشنیارەکەی من بووە هۆی ئەوەی تا ڕادەیێک بە ئاسوودەییەوە بژین؟

وتیان:

- بەڵێ وابوو، بەڵام ئێستا نۆرەی براکەی خۆتە. دەتەوێ ئەو یاسایەی کە خۆت داتناوە هەڵوەشێنیتەوە؟

کەرویشک وتی:

- بە پێچەوانەوە، دەبێ هەمووان گوێڕایەڵی یاسا بین. من و براکەشم بۆ گیانبازی ئامادەین، بەڵام بیرێکی باشم کردۆتەوە، ئەگەر سەر بگرێ لە دەست شێری زالم ڕزگاریمان دێت.

وتیان:

- دە پێمان بڵێ چ بیرێکت کردۆتەوە؟

وتی:

- کەمێ دێر بمنێرن، ئەو کات بە تەنیا دەڕۆم و هەمووتان ڕزگار دەکەم. ئێستا هیچتان پێ ناڵێم ڕەنگە کەسێک بیەوێ خەیانەت بکات. بنەماڵەکەم لای ئێوە دەبن، ئەگەر درۆم لەگەڵ کردن و هەڵاتم، سووک و بێئابڕوو دەبن، هەر وەک کەسانی خەیانەتکار کە ڕووڕەش دەبن.

لە بەر ئەوەی جگە لە خێر و چاکە هیچیان لێی نەدیتبوو بە قسەیان کرد. کەرویشکی زیتەڵە دوای ماوەیێک بەرەو ماڵی شێر کەوتە ڕێ. لەو لاشەوە شێر

لەوەی کە خواردنەکەی دواکەوتبوو زۆر تووڕە بوو و لە بەر خۆیەوە چل چل ئەیکوشت و بیس بیس ئەینیا باقە و دەیگوت: دەزانم چیتان بە سەرا دێنم.

لە ناکاو لە دوورەوە کەروێشک دەرکەوت و خەمبار دەینواند. کە لە شێر نزیک بووەوە، ئاو زاییە چاوەکانی و سلاوی کرد.

شێر گوتی:

- ئەوە تا ئێستا لە کوێ بووی؟ بۆ بە تەنیا هاتووی؟ نەکا بڕیارەکەتان پشت گوێ خستووە؟

کەروێشک وتی:

- نا قوربان، دەمەونیوەڕۆ کەروێشکێکی خرپنم بۆ هێنای، بەلام شێرێکم لێ ئاسەلا بوو، لە چنگی دەرهێنام. هەرچی لێی پاڕامەوە کە ئەمە خواردنی شێرە، هیچ سوودێکی نەبوو. بە قسەی نەکردم و وتی: شێر چ کەرێکە. ئێرە هەرێمی منە و لە من گەورەتر کەس نیە. دەنگ بکەی دەنگت ئەچنم. زۆرێک قسەی ناشیرینی پێی گوتی، گەر دەمتوانی شلەکوتێکم دەکرد، بەلام زۆر بەهێز بوو. هیچم پێ نەکرا. هەلاتم تا بزانم دەبێ چی بکەین؟

شێر کە قۆڕەی سکی دەهات و لەولاشەوە برابەشی بۆ پەیدا ببوو، چاوی پەڕیبووە تەوقی سەری. بە کەروێشکی وت:

- دەتوانی ئەو شێرەم نیشان بدەی؟

کەروێشک وتی:

- بەڵێ، لەم نێزیکانەدا لە پشتی دارەکانەوە خۆی شاردۆتەوە.

شێر وتی:

- وەرە با بڕۆین، نیشانی ئەدەم مەنێ ماس چەندی کەرەی پێوەیە.

شێر و کەرۆیشک ڕۆیشتن تا لە دارستان دەرچوون. لە نزیکی تەپۆلکەییەکەوە کە چالاویکی لێ بوو کەرویشک ڕاوەستا. شێر وتی:

- بۆ ناچیتە پێشەوە؟

کەرویشک وتی:

- زۆر ئەترسم، چونکە لە نێو ئەم چالاوە دایە.

شێر وتی:

- گەوجە، تا من لە پشتتم لە چ دەترسی؟

کەرویشک بۆ ئەوەی زۆرتر تاوی بدا وتی:

- گەورەم، ئاگادار بە چونکە بە دەستیەوە هەلناکەی.

شێر وتی:

- تۆ نیشانمی بدە و کارت نەبێ.

کەرویشک گوتی:

- شێرەکە لە نێو ئەم چالەدایە، بەلام ناوێرم بێمە پێشەوە.

شێر لە لێواری چالاوەکەدا ڕاوەستا. کەرویشکیش چوو لە بەر دەمیا دانیشت. کە وێنەکەی خۆیانی لە نێو ئاوەکەدا بینی وتی:

- ئەمە هەر ئەو شێرەیە و ئەوەش ئەو کەرویشکەیە کە لە چنگی دەرهێنام.

شێر کە سەیری کرد پێی وا بوو دوژمنە. هەر بۆیە خۆی هاویشتە نێو ئاوەکە تا شەڕی لەگەلدا بکات. شێرەکە نغرۆ بوو و کەرویشکەکە بە خۆشحالییەوە گەڕایەوە لای هاورێکانی و موژدەی پێدان کە شێر گەیشتە سزای خۆی.

گیانلەبەران کردیانە پلەزیقان و زانییان کە زۆربەی کـات مێشـک لـە زۆر و بوێری بەکارترە.

ڕێبەندان ۲۷۱۲

**سەرچاوە:**

**۱- قصەهای خوب برای بچەهای خوب (۱)، صص ۱۸-۱۴.**

# کەر و گا[1]

نووسینەوە: مێهدی ئازەریەزدی

هەبوو نەبوو، کابرایێکی دێهاتی کەرێک و گاییێکی بوو. کەرەکەی هێشتبووەوە بۆ سواری و گاکەی دەبردە جووت کردن.

ڕۆژێک گا کە زۆر هەرەکیابوو، هاتەوە ماڵ و لە بەر خۆیەوە دەیبۆلاند. کەر لێی پرسی:

- ئەوە چیە هاوڕێ؟ بۆ ئەوەندە خەمباری؟

گا گوتی:

- «دەسم لێی مەدە گش گیانم زامە/ تازە زامیٚتر داگیە لەم لامە»[2] بە ڕاستی لە ئێوە کلۆلترین.

کەر گوتی:

---

١- چیرۆکێک لە «نفحه‌الیمن».

٢- فۆلکلۆر.

- ئەم قسانە چین؟ چ جیاوازییێکی هەیە؟ ئێمە بار دەبەین، ئێوەش بار دەبەن.

گا وڵامی دایەوە:

- زۆریش جیاوازی هەیە. تەنیا بۆ سواری و بارەبەری ئێوەیان گەرەکە، بەڵام ئێمە دەبێ جووت بکەین، لە دواییشدا تووشیاری قەساب دەبین. ئەمڕۆ ئەوەندە کاریان لێم کێشاوەتەوە وەختە گیانەکەم دەرچێ. نازانم چ گوناحێکم کردووە وام بە سەردا هاتووە؟

کەر زگی پێی سووتا و گوتی:

- دەتەوێ فێڵێکت پێ بڵێم بۆ ئەوەی جووت کردن لە کۆڵت بێتەوە؟

گا گوتی:

- نازانم، دەترسم کەرانەیێکم فێر بکەی قوڕێکی‌ترم بۆ بپێژی.

کەر گوتی:

- نەخێر، ئەوەندەش کەر نیم، بۆیە نامبەن جووتم پێ بکەن. جارێک بە قسەم بکە، تا ئەو جێیەی کە دەزانم هەرچی کاری دژوارە بە گا زلەکان دەیکەن و هەرچێ باشتر مل پانەو کەی فرەتر کارت لێ دەکێشنەوە. بە ڕای من دەبێ خۆت کەیتە نەخۆش و هیچ نەجووڵێی. کەس ناتوانێ بە زۆر کارت لێ بکێشێتەوە.

گا وتی:

- دەی باشە، دارێکم لێ هەڵئەگرن و ڕۆحم چای ئەکەنەوە.

کەر وتی:

- بە ڕای من دوو شەقت تێ هەلدەن باشتر لەوەیە هەمیشە کارت پێ

بکەن. بەیانی کە دێنە سەروەختت دەبێ لە سەرزەوی ڕاکشێیت و نەجوولێیتەوە. بەمجۆرە وازت لێ دەهێنن.

گا وتی:

- بە خوا ڕاست ئەکەی، هەرچەند کەری بەڵام ئەمە تەگبیرێکی ژیرانەیە.

بەیانی گا لە سەر زەوی ڕاکشا و دەستی کردە بۆڕەبۆڕ. خاوەنەکەی هەرچی کرد نەیتوانی هەڵیسێنێ. لە گەوڕەکە چووە دەرەوە تا بیرێکی بۆ بکاتەوە. کەر وتی:

- نەموت! جا بێژە کەر هیچ نافامێ.

پاش ماوەیێک کابراکە هاتەوە و لە بەر ئەوەی گایێکی‌تری نەدۆزیبووەوە کەرەکەی کۆپان کرد و لەگەڵ خۆی بردی.

کەر کە دەچووە دەرەوە بە گای وت:

- لە بیر نەکەی تا شەو هەروا خۆت کەیتە نەخۆش، ئەگینا ئەتبەنەوە بۆ جووت کردن.

گا وتی:

- دەستت خۆش بێ. خوات لێ ڕازی بێت.

کابرا کەرەکەی برد و لە جیاتی گا جووتی پێ کرد. کەر لە بەر خۆیەوە وتی:

- ئەوەیە ئەیژن دەم ڕاوەستێ سەر سلامەتە. خوا خراوت بۆ بکا بۆ خۆت و ڕاوێژت.

کەر هەر ئەکەفتە بیری گا ئەیوت:

- چ کەرێکم بە خوا.

دەمەو نیوەڕۆ کە زۆر ماندوو بوو، لەبەر خۆیەوە وتی: باشتر وایە منیش ئەو فێڵە بە کار ببەم. خۆی پان کردەوە و دەستی کردە سەرەسەر. کابرا دارێکی لێ هەلگرت، بەر بووە گیانی و وتی:

- مەگەر نازانی گا نەخۆشە؟ هیچ نەبێ ئەو گۆشتەکەی هەیە، بەلام تۆ... خەیال ئەکەی ئەو ئالف و ئاوە خۆڕاییە؟ بە خوا کار نەکەی ئەتتۆپێنم.

کەر زانی کە دەرچوونی بۆ نییە، سەری داخست و تا شەو نقی دەرنەهات. شەو کە گەڕایەوە گەوڕ لەبەر خۆیەوە وتی:

- چ کەرێکم. بە دەستی خۆم مالی خۆمم کاول کرد. هەر چۆنێ بێت دەبێ کارێک بکەم لە کۆڵ خۆمی بکەمەوە.

گا کە ئەمانەی ژنەفت وتی:

- بەم کارەی کە بۆ منت کرد نیشانت دا ئەوەندەش کەر نیت.

کەر وتی:

- لە گەوڕا خەوتوویت و لە دنیا بێخەبەری. ئەمڕۆ شتێکم بیست، ئەیژیتە ئاگریان نیا جەرگمەوە.

گا وتی:

- ئەگەر چووبیتە جووت کردن ئێستا ئەزانی چیم کێشاوە.

کەر وتی:

- بە پێچەوانەوە، زۆریش خۆشە. بەلام شتێکم بیستووە ناوێرم پێتی بلێم.

گا وتی:

- هەرچی هەیە بیدرکێنە، ناترسم.

کەر وتی:

- هیچێ، خاوەنەکەمان ئەمڕۆ لەگەڵ دۆستێکیا قسەی ئەکرد. ئەیوت کار کردن کەر سەد ئەوەندەی گایە. گاکەیشم نەخۆشە. سبەینێ دەیفرۆشمە قەساب با گۆشتەکەی زایە نەبێت. باوەڕ بکە نەمدەویست کڵاو بنمە سەرت. نەمدەزانی ئەمەی بە دواوەیە. ئەگەر ئەتەوێ چەند ڕۆژێ‌تر بخەوە.

گا «ڕەنگی بوو بە جاوی سپی» و وتی:

- نەخێر، هەر ئەمڕۆ بەسە. هەر دەمزانی دەمنێتە هەڕگ.

کەر هەناسەیێکی هەڵکێشا و وتی:

- خۆت ئەزانی، جووت کردن زۆر خۆشە.

گا وتی:

- خۆم ئەمزانی، کلاوت نایە سەرم.

کەر وتی:

- ئەوەیە ئەیژن خاسیکەرە خۆڵ بە سەرە. هەر دەمزانی وەک نیسک بەر و پشتت بۆ نییە.

بەیانی کابرا گای دا بەر و بە کوڕەکەی وت:

- تۆش گاواسنێک ببەستە کەرەکە و کاری پێ بکە. چێویکشی لێ هەڵگرە با خۆی کەر نەکات!

ڕەشەمە ۲۷۱۲

**سەرچاوە:**

**۱- قصه‌های تازه از کتاب‌های کهن.**

شوکور بۆ خوا لێرەدا چیرۆکەکان تەواو بوون و ئـەنوەر وازی لێم هێنا. دە بابە بە خوا، بە پیر، بە پێغەمبەر فێڵـەباز نـیم. خەڵک بوختانم بۆ دەکەن. بە خودا ئەم ژیانە وای لێکردووم بە فێڵەباز بەناوبانگ بم. تا ئەو جێیەی دەزانم لە بنەماڵـەی ئێمەدا کەسمان نەبووە جامقولیباز بێ. ئیتر نازانم ئەنوەر ئەم ناوەی لە کوێ هێناوە و وەکوو تەوقی لەعنەت خسـتوویەتە ملم. پڕکێشی ناکەم لە ماڵ وەدەرکەوم، هەرکەس دەمبینێ تیتاڵیم پێ دەکا. ئەگـەر خـەمی نـان لێمگـەڕێ زۆری پـێ ناچێ منیش وەکوو ئاژەڵانیتر بەختـەوەر دەبم. ئـەو کـات کەس ناوێرێ خراپ سەیرم بکات. مامۆستا قانع وتەنی:

ڕێـــوی نـــانی بـــێ شـــێری تـــەواوە
شـــێر نـــانی نـــەبێ پشـــتی شـــکاوە

www.iqra.ahlamontada.com

# فه رهه نگۆک

**برابەش:** هاوبەش لە مالی دنیادا

**بژوێن:** زەمەند، مێرغوزار

**بەراز:** یەکانە

**بێلاسن:** پێمەڕە، خاکەناز

**پسکەپسک:** بە شێنەیی، بەکاوەخۆ

**پلەزیقان:** شایلۆغان

**پەژیوان:** پەشیمان

**تامسار:** تامی ناخۆش

**تەرچک:** تورت

**تەلیس:** گۆنی

**تەمادەر:** چاوەڕێ، چاوەڕوان

**تەوس:** پلار، توانج

**تیتالی:** قەشمەری کردن

**جامقولیباز:** فێلەباز

**جوالە:** هەگبە

**چالەکە:** گۆڕهەلکەنە

**چۆلەوانی:** چۆلگە

**چەمەڕا:** وشەیێکی هەورامییە، چاوەنوار، چاوەنۆڕ، چاوەڕێ

**خرپن:** قەلەوی کورت

**خوێناول:** خوێناوی

**خومچی:** دەبباغ

**دەعبا:** جانەوەر

**زەردەلە:** لاواز، لەڕ، ڕووتەلە، ڕەقەلە، ڕیوەلە

**زەڕنەقووتە:** بێچووی تازە هەلهاتوو لە هێلکە.

**سمنج:** گەوج، گەمژە، لاژگ، گێل

**شالاو:** هێرش بردنە سەر شتێک یان کەسێک

**شەتەک‌دان:** توند بەستن

**قوڕمساخ:** وشەیێکی تورکییە، جۆرە تەوهینێکە

**کالفام:** گێژ، وڕ

**کلکەسووتە:** زمان‌لووسی

**کووپە:** گۆزە

**کەرانە:** باج سمێل

**کەلەمە:** گوریسێکە لە کاتی جووت‌کردندا بە ملی گاوە دەیبەستن.

**کۆلەشەڕ:** جۆرە تەوهینێکە، قەشقە، کۆلە نەهامەت

**گوێڕایەل:** فەرمانبەر

**گەلەکۆمە:** هێرشی بەکۆمەل بۆ سەر شتێک یان کەسێک

**مافوور:** قالی، ڕایەخ

**ملەتاتکێ:** قاسۆ کێشانن

**نغرۆ:** ختکاو

**هەڕەکیان:** ماندووبوونی زۆر

**هەژگ:** دڕک، دڕوو

**هەلتووتان:** هەلترووشکان

**هێشخان:** زووری کەلوپەل و ئازووخە لە کۆندا و بڕێ جار لەوێدا خواردنیان دروست دەکرد.

# پاشکۆ

**ئاوی دا بێخیا: واتە هەمووی خوارد و هیچی نەهێشتەوە.**

**ئاخ و ئۆخیان لێ بڕی:** زۆر لێدان لە کەسێک هەتا دەمی مردن.

**ئەم دڕکە لە ژێر پێت دەرتێرم:** تۆڵەت لێ دەکەمەوە.

**بای بالیان بڕی:** زۆر لێدان لە کەسێک هەتا دەمی مردن.

**بە دەستیەوە هەڵناکەی:** پێی ناوێری.

**پاییزەبرا:** مەبەست ئەو کەسانەیە زۆر بە دەگمەن بۆ شوێنێک دەچن کە بەرانبەرەکەی لە فارسیدا «ستارەی سهیل»ە.

**تا چەرمت ڕەق نەکەم وازت لێ ناهێنم:** جۆرێک هەڕەشەیە

**تفت هەڵخستبا لە ئاسمانا ئەیبەست:** یانی هەوا زۆر سارد بوو.

**تف لە دەمیا وشک بوو:** یانی زۆر ترسا.

**چاوی پەڕییە تەوقی سەری:** یانی زۆر تووڕە بوو.

**چل‌چل ئەیکوشت و بیس بیس ئەینیا باقە:** لەبەرخۆوە هاشە و هووشە کردن

**چەرمی چاوتان ڕەق دەکەم:** جۆرێک هەڕەشەیە

**چەقۆت لێ بدا خوێنی دەرناهات:** یانی زۆر نارەحەت بوو.

**خاسیکەرە، خۆڵ بە سەرە:** مەبەست ئەوەیە کەسێک چاکەیێک بۆ کەسێکی‌تر بکات، بەڵام تووشی کێشەیێک بێت.

**خوا گەرەکی بێت ڕزق قالاوێک بگەینێ، کەرێکی بۆ ئەتۆپێنێ:** مەبەست ئەوەیە خودا بیەوێ ڕزقی کەسێک بگەینێ بە هەر شێوەیێک بووە، دەیگەینێ.

**خولتە کردن:** پێدا هەڵگوتن، تاریف کردن و هەڵشاخاندن بە کەسێکدا.

**داریان دا بە ڕۆحیا:** زۆر لێدان لە کەسێ هەتا دەمی مردن.

**دەسەسەر کردن:** لە کۆڵ خۆ کردنەوە.

**دەمی بووە تەڵەی تەقیو:** دەستەواژەیێکی کوردیە یانی نەیتوانی هیچ بڵێت.

**دەنگ بکەی دەنگت ئەچنم:** جۆرێک هەڕەشەیە

**ڕۆح کەسێ چای کردنەوە:** زۆر لێدان لە کەسێک هەتا دەمی مردن.

**ڕەنگی بوو بە جاوی سپی:** یانی زۆر ترسا

**ڕێخ لە نێو کلاشماندا نیە:** واتە دوو ڕوو و فێڵەباز نیم.

**ڕێوی تا قەباڵەی خۆی خوێند پێستیان کەند:** ئاماژەیە بۆ ئەو کەسانەی تا بێتاوانی خۆیان بسەلمێنن، تووشی کێشەیێک ببن.

**زیپی لێیان تەنگ کردبوو:** ژیانی لێیان تاڵ کردبوو

**سەربەنێ گرێ دان:** یارمەتی دانی کەسێک

**شلە کوت کردن:** دەستەواژەیێکی کوردیە بە مانای لێدانی کەسێک.

**شواڵ کەوتە دەرقاچی:** بریتیە لە کەسێک کە بە هۆی کارێکەوە ئابڕووی چووبێ.

**قوشقی بوون:** تووڕە بوون.

**کتک ئەخەمە شواڵت:** جۆرێک هەڕەشەیە

**کولە گرتن:** خۆ مەلاس دان.

**کەلەمەت دەجەڕنم:** جۆرێک هەڕەشەیە.

**کەوتنە گوو خواردن:** ئاماژەیە بۆ کەسانێک کە گاڵتە بە کەسێک دەکەن، بەلام کە تووشی گرفتێک دەبن داوای یارمەتی لێ دەکەن.

**گوو بە کلاوی کەسێک نەپێواندن:** بە هیچ نەگرتن.

**لە گون گا ڕووتترە:** مەبەست ئینسانی هەژارە.

**لێو لە بان دەمیەوە ڕەق بوو:** یانی زۆر ترسا.

**نیشانی ئەدەم مەنێ ماس چەندی کەرەی پێوەیە:** جۆرێک هەڕەشەیە

**وەک نیسک بەروپشتی بۆ نییە:** ئامازەیە بۆ ئینسانی دووڕوو کە هیچی لەبەرچاو نەبێت.

## سه رچاوه كان:

١- آذریزدی، مهدی، قصه‌های تازه از کتاب‌های کهن، چاپ یازدهم ١٣٨٣.

٢- آذریزدی، مهدی، قصه‌های خوب برای بچه‌های خوب (١) داستان‌های کلیله و دمنه: بازنویس: مهدی آذریزدی، انتشارات امیرکبیر چاپ اول ١٣٨٨.

٣- آسمند، علی و خسروی، حسین، افسانه‌های چهارمحال و بختیاری، انتشارات ایل، چاپ اول ١٣٧٧.

۴- بهرنگی، صمد و دهقانی و بهروز، افسانه‌ها و قصه‌های آذربایجان، چاپ اول ١٣٨٢.

۵- درویشیان، علی‌اشرف و خندان (مهابادی) رضا، فرهنگ افسانه‌های مردم ایران جلد (۶)، انتشارات کتاب و فرهنگ، چاپ اول ١٣٨٠.

پەند و قسەی نەستەق کۆمێدی کە بە زاری ڕێوییەوە وتراوە شتێکی تایبەت نییە بە گەلی کورد و هەر ئەم گەلە نەبووە کە ڕێوی بە فێڵەباز و زۆرزان بزانێ بەڵکوو لەناو گەلانی جیهاندا زۆر حەکایەت و پەندی کۆمێدی بە زاری ئەم گیانلەبەرەوە وتراوە، واتە لە کەلەپووری زۆر نەتەوەی تردا هەمان تێڕوانین بۆ ئەم گیانلەبەرە هەیە. وەکوو نەتەوەی عەرەب و گەلانی باشووری ئەورووپا.

وتیان ڕێوی چەند پەند دەزانی؟

وتی: نەوەد و نۆ، چاکترینیان پێچ کردنەوەیە.